# ڕەوشی حوجرە

## لە

## پێگەیاندنی زانا ئایینییەکانی شاری هەولێر

دانانی
عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی

چاپی یەکەم
١٤٢٨ کۆچی ٢٧٠٧ کوردی ٢٠٠٧ زایینی

# ڕەوشی حوجرە
# لە
# پێگەیاندنی زانا ئایینییەکانی
# شاری هەولێر

دانانی

عمر شێخ لطیف بەرزنجی

چاپی یەکەم
١٤٢٨ کۆچی- ٢٧٠٧ کوردی- ٢٠٠٧ زایینی

ئەم کتێبە، بە یارمەتی
وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی لەهەرێمی کوردستان لە چاپ دراوە

* رەوشی حوجرە لە پێگەیاندنی زانا ئایینییەکانی شاری هەولێر
* دانانی عمر شێخ لطیف بەرزنجی
* پیت چنین و نەخشەسازی و بەرگ: کۆمپیوتەری دەریا
* تیراژ: ( ١٠٠٠ ) دانە
* چاپی یەکەم ٢٠٠٧
* چاپخانەی منارە- هەولێر
* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧١٧ ) ساڵی ( ٢٠٠٧ ) دراوەتێ

# پێشکەشە بە:

١- هەموو دەرچووانی (حوجرە) لەهەرێمی کوردستان.

٢- هەموو ئەو کەسانەی کە بەدڵسۆزیەوە خزمەتی حوجرەیان کردووە.

٣- هەموو ئەو زانایانەی رۆژێ لەرۆژان ئەرکی حوجرەیان لەئەستۆ گرتووە.

٤- گۆڕی خوالێخۆشبوو (شێخ لطیف شێخ رضا) لەگۆڕستانی گەڕەکی رەحیم ئاوە لەشاری کەرکوکی خۆشەویست.

٥- جگەرگۆشە خۆشەویستەکانم، بەتایبەت (د.هێمن) لەووڵاتی بەریتانیا.

نووسەر

عمر شێخ لطیف بەرزنجی

هەولێر- ٢٠٠٦/١٢/٣١

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی:

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى اله واصحابه ومن والا، وبعد..

هەموو ئەوە چاکدەزانین کەنەتەوەی کورد یەکێبوو لەو نەتەوانەی کە لەسەرەتاوە باوەڕیان بەئاینی پیرۆزی ئیسلام هێناو بێ دڵەڕاوکێ چوونە ناو ریزەکانیەوە. هەر پاش باوەڕ پێ هێنان و بەئیسلام بوونیان، کەوتنە هەڵپەو سەودای پەیداکردنی شارەزایی لەبنەماکانی و کۆکردنەوەی زانیاری تەواو لەدەقەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ)..

پاش چەند ساڵێك، بەسەدان مەڵبەندی تایبەت بەم زانیاریانە لەکوردستان پەیدا بوو، منداڵی کورد کۆمەڵ کۆمەڵ بە (سیپارە)[1] وە روویان لەو مەڵبەندانە کرد، شارو شارۆچکەو گوندەو گەڕەك نەما لەم کوردستانە (حوجرە)ی خوێندنی تیا نەکرێتەوە، هەر یەکێ لەو حوجرانە، بەدەیان منداڵی کوردی بۆ فێربوونی خوێندەواری لەئامێز گرت.

بەم پەرۆشییەوە، منداڵی کورد، حوجرەکانیان ئاوەدانکردەوە، کڵاوی فەقێیایەتیان لەسەرنا، بەگەرماو بەسەرما، لەنزیك و لەدوور، بەنەبوونی و بێکەسی، هەموو خۆیان پێگەیاندو ئەم ئاینە پاکەیان لەکوردستان بڵاوکردەوە.

رۆژانە لەم کوردستانە، دەنگی بەسۆزی خوێندنی فەقێ دەچووە ئاسمانا.

زانا ئایینیەکان دەرس ووتنەوەیان بەپیرۆزترین ئەرکی ئەستۆی خۆیان دادەنا، لەهیچ کات و ساتێك، لەژێر هیچ گوشاریەك، بەهیچ بیانویەك خۆیان لەو ئەرکە نەدەدزیەوە. لەهەموو بارودۆخێك لەگوتنەوەی دەرسی حوجرە دوا نەدەکەوتن.

---

1- بریتی بوو لە (٣-٤) لاپەڕەو تەواوی پیتە هیجائی و حەرەکییەکانی لە خۆ دەگرت بەسەرو بۆرەوە، لەگەڵ سورەتی (الفاتحە)و دوعای (التحیات)ی ناو نوێژ.

فەقێیان دەبووایە ڕۆژانە بەشە دەرسی خۆیان هەبێ، زانایانی ئەم نەتەوەیە بووار نەما خزمەتی ئەم ئاینەی تیا نەکەن، هەر لەدەرس ووتنەوەوە بگرە تاکو دەگاتە ئەرکەکانی ڕۆژانە یان وەکو (پێش نوێژیو وتار خوێندنەوەو ڕێنماییو ئامۆژگاری کردنی خەڵکی).

نووسین و دانانی هەزارەها کتێبی بەپێز لەسەدان بوواری ژیان، ڕاڤەو شیکردنەوەی هەزارەها بابەتی ئایینی بۆ فەقێیان.

نەتەوەی کورد سەدان زانای ناوداری تیا هەڵکەوت هەتا هەتایە مێژوو ستایشیان دەکات بەشانازییەوە لەبارەیانەوە دەدوێ.

سەدانیان لەڕێگای ئەم ئاینە پیرۆزە، وەکو مەشخەڵێك بوون بۆ ڕووناکرد نەوەی ڕێگاکە. نووسین و داهێنانەکانیان، بوون بەپەیڕەو پرۆگرام بۆ خوێندن لەحوجرەکانی جیهانی ئیسلامی، لەوانە (ئیمامی رافعی، ئیمامی سەعدی تەفتەزانی، ئیمامی بوخاری، ئیمامی قطب الدین رازی، ئیمامی سیبەوەیهی، ئیمامی جارالله زەمەخشەری) ئەمانەو هەزارەها زانای ناودارو لێ هاتوو لەم نەتەوەیە پەیدا بوون.

شاری هەولێریش هاوشێوەێ سەرجەم ناوچەکانی کوردستانی گەورە، ڕەوشی باڵای لەم تەوەرە هەبوو، سەدان زانا بەتواناو کەم وێنەی تیا هەڵکەوت. ڕۆژێ لەڕۆژان، ئەم هەولێر مەڵبەندی بڵاوکردنەوەی زانستییە ئاینییەکان بوو لەناودارەکانی ئەم چەند ساڵەی ڕابوردوو، زانای ناودار (مەلافەندی، شێخ مصطفی نەقشبەندی، هەرشەمی، مامۆستا مەلا صالح کۆزەپانکە، مەلا محمد امین بێتواتە، زانایانی گەڕاو، بنەماڵەی فەرهادیو حەیدرییەکان، زانایانی بەحرکەو زیارەت و دیبەگەو ناوچەی شارۆچکەی پردێ).

سەدان زانای وەکو ئەم زاتانە لەسنووری ئەم شارە پەیدا بوون بەڵام بەداخەوە ڕەوشی خوێندنی حوجرە عەیامێکە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەکورتی دەدات، بەرەو نەمان دەچێ، ڕاستە زانای بەتوانامان زۆرە، بەڵام مەلاکان بەرەو نەمان دەچن، مەخابن بۆ ئەو سەردەمە کەبەرەو نەمان دەچێو ئەگەری فەوتانی لێدەکرێ. هەر زانای کورد بوو گەیشتە چەندین بەش لەجیهانی ئیسلامی بەگشتی لەوڵاتی خۆمان بەتایبەتی، دەیان

زانامان گەیشتە شاری (بەغداو بصرەو سامراء و رمادیو دیالیو کوبیسەو هیت و عانەو فەلوجە).

کوبێسە لەسەدان ناوچە، زانای کورد مەشخەڵی بڵاوکردنەوەی ئاینی بوون، ئەمەش خۆی لەخۆیدا وەکو (وسام)یە کە بەسینەی مێژووی روناکی ئەم نەتەوەیە.

بەم شێوەیە کورد خزمەتی ئەم ئاینە پیرۆزەیان کرد، هەر لەپێناوی فێربوونی خوێندەواری بوو گەیشتنە دەیان وڵات لەوڵاتە ئیسلامیەکان وەکو (تورکیا، ئێران، سوریا، مصر، حیجاز، چین، بوخارە، سەمەرقەند، پاکستان). بەسەدان زانای کورد بەپلەی بەرز زانکۆی (الازهر)[1]یان تەواوکرد.

بەم هەموو سۆزو حەزو ئارەزووەوە، بەرەو پیری ئەم ئاینە چوون. سەدان ساڵە زانای کورد بەهەموو توانایانەوە لەم شارە خزمەتی ئەم ئاینە دەکەن و بەرگری لەفەوتاندنی بنەماکانی دەکەن.

لەخوای گەورە دەپارێنەوە، پاداشتی چاکەیان بداتەوەو جێگایان بەهەشت بێ.

منیش هیوادارم بەنووسینەوەی ئەم کتێبە، توانیبێتیم کەلێنێك لەمێژووی گەلی کورد لەم شارە پڕ بکەمەوە هاوکات لەناخی دڵمەوە داوای لێبوردن و چاوپۆشی لەهەمووتان دەکەم لەهەموو هەڵەو کەم و کورتیەك کە لەم کتێبە بەدی بکرێ، تەنها هەر خواش هەڵە ناکات، بەڵام دڵنیابن کەهەر هەڵەیەك هەبێ بە (ئەنقەست) نیە لەم بارودۆخە هەر ئەوەندەم لەدەست دێ.

**نووسەر**

**عمر شێخ لطیف بەرزنجی**

**هەولێر ٢٠٠٦/١٢/٣١**

1- الازهر- یەکێکە لە زانکۆ بەناو بانگەکانی نێودەوڵەتی لەوڵاتی میصر، بەتایبەت لەبواری ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

# بەشی یەکەم

# کورتەیەك لەبارەی

# خوێندن لەحوجرەکانی کوردستان

وەکو هەموو دەزانین بەر لە سەرهەڵدان و پەیدابوونی قوتابخانە حوکومییەکان، تاکە سەرچاوەی خوێندەواری حوجرە بوو، هەرچی بلیمەت و زاناو سەرکردەی ئەم نەتەوەیە هەبوو، دەرچووی ئەو حوجرانە بوون، زۆربەیان هەڵگری بڕوانامەی مەلایەتی بوون.

تەواوی روناکبیرو ئەدەب دۆست و شاعیرو نووسەری ئەم گەلە، لەمەلایەتیەوە پێگەیشتبوون و هاتبوونە ریزی ناوداران.

تەواوی شارەزایی و زانستییەکانیان لەحوجرە دەست کەوتبوو سەرکردەو سوارچاککانی ئەم نەتەوەیە، رۆژی لەرۆژان فەقێ بوونە، وێنەی (خوالێخۆشبوو شێخ محمودی حەفیدو قازی محمدی پێشەواو سەرۆك بارزانی نەمر) سەدان لەم شێوەیە.

نەتەوەی کورد، بەدڵسۆزانە سەنگەری لەنەخوێندەواری گرت و دەیان کەلێنی بۆ دەربازبوون لەشورە پۆلاینەکەی کرد. زۆر بەپەرۆشەوە باوشیان بۆ زانست کردنەوە هەنگاویان بەرەو رووی نا. خەڵکی کوردستان لەپێناوی خوێندن بوون بەسێ بەشەوە بەشێك زانا بوون، بەشێك زانست خواز، بەشی سێیەم، بەهەموو توانایەوە یارمەتی (مەلاو فەقێ)ی دەداو لەپێناوی سەرکەوتنی ئەو پرۆسەیە لەهەوڵداندا بوون، ماڵی واهەبوو لەگوندەکان خۆی خۆراکی ئێوارەی نەبووایە، دەبوو (راتبە)[1]ی فەقێیان دابین بکات، ئەو کەسایەتیەی خۆی ردێن سپی و پیاو ماقوڵ و برا گەورە دابنایە، دەبوو راستەوخۆ تەواوی ئەرکی دابین کردنی پێداویستیەکانی (حوجرە) لەئەستۆ

---

1- راتبە: بریتییە لەو جەمە خۆراکەی کە خەڵکی ئاوایەکان بۆ فەقێیان دابینی دەکەن، هەر جەم بەکاتی خۆی.

بگریّ، بەدەست و دیاری شیاوەوە سەردانی مەلاو فەقیّ بکات، لەهەموو بۆنەیەك بەڕوو خۆشییەوە بەرەو پیریانەوە بچێت، لەهەموو دەڤەرەکان تەواوی کەم کورتی مەلاو فەقیّو حوجرەو مزگەوت و تەکیە، لەسەر بڕا گەورە بوو، بڕا گەورەکان خەمخۆری راستەقینەی ئەو لایەنانە بوون، تەواوی گرفتەکان رووبەڕووی ئەوان دەکرایەوە، هەر ئەوان چارەسەری شیاویان بۆ دادەنا.

## سەرەتای پەیدابوونی ئەم جۆرە خوێندنە

وەکو لەرێورەسمی بڕوانامە بەخشین دا دەرکەوتووە، کاتیّ مامۆستایەکی (مجیز)، بڕوانامەی مەلایەتی دەداتە یەکیّ لەفەقێیەکانی. لەسەرەتاوە لەبڕوانامەکەی خۆیەوە دەدویّ، کەی وەری گرتووە، لەسەر دەستی کیّ بووە، دەست بەدەست پێیدا دەڕوات تاکو دەگاتە حەزرەتی (ئیمام عمرو ئیمام علی) رەزای خوایان لیّ بێت.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنیّ، کەسەرەتای ئەم جۆرە خوێندنە لەو کاتەوە پەیدا بووە، بەداهاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، کەسانێك پەیدا بوونە ئەرکی راڤەو شیکردنەوەی فەرموودەکانی خواو پێغەمبەری خواو بنەماکانی ئاینییان لەئەستۆ گرتووەو پێی هەستاون، ئەم کارەش هەروەها سانا نیە، بۆیە دەیان زانای بەتوانایان تیا پەیدا بووە، زۆر بەزانستیانە هەموو لایەنەکانیان بۆ نەوەی دوایی خۆیان تۆمارکردووە. کەوابوو سەرەتای سەرهەڵدان و پەیدابوونی (حوجرە) بۆ سەرەتای سەرهەڵدان و پەیدابوونی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەگەڕێتەوە.

## بەرز نرخاندنی حوجرە

لەو سەردەمەی کەئاماژەمان بۆ کردو بەسەرەتای پەیدابوون و هاتنەکایەی حوجرەو خوێندن لەقەڵەمان دا، بگرە تاکو ئەم چەند ساڵەش حوجرەو خوێندنی ئاینی بایەخی تەواوی پیّ دەدراو پشتگیری تەواوی لێدەکرا. تەواوی (خەلیفەو سوڵتان و پاشا)کان راستەوخۆ هات و چۆی حوجرەیان دەکرد، دابین کردنی

پێداویستی حوجره لەئەستۆی ئەوان بوو، بەدڵسۆزانە پەلاماری تەواوکردنی کەم و کورتیەکانی حوجرەو مەدرەسەی ئایینیان دەدا، بەهەموو توانایانەوە کاریان بۆ سەرکەوتنی دەکرد، زانای ئاینی پلەو پایەی بەرزی لای ئەو سەرکردانە هەبوو، سەرجەم سەرکردەکان رێزی بێ سنووریان لەزانا دەگرت ئامۆژگاریەکانیان لەلا پەیرەو بوو، داخوازییەکانیان فەرمان، لەهەموو هەنگاوێك زانای ئاینی سەرقافلە بوون، لەهەموو هەڵوێستێك، زانای ئاینی دەست پێشخەر بوون. هاندەری هەموو کردەوەیەکی مرۆڤانە بوون، لەهەموو سەردەمێك مەشخەڵی روناکردنەوە بوون، راوێژکاری دڵسۆزو راست گۆی سەرکردەکان بوون. هەندێ لەو هەڵوێستە جوانانەی بەرامبەر بەزانا، تاکو ئەمڕۆش کەسانێك هەن رەچاوی دەکەن و لەسەری دەڕۆن.

# شێوەی خوێندن لەو حوجرانە

بە بەراورد لەگەڵ شێوەی خوێندنی قوتابخانە فەرمییەکانی میری ئەم سەردەمە، لەدەیان خاڵدا یەکتری گیر نابن، لەوانە:

١- مەرج نیە فەقێش وەکو قوتابی لەمنداڵیەوە دەست بداتە خوێندن.

٢- مەرج نیە لەماوەیەکی دیاری کراو، لەتەمەنێکی دیاری کراو، قۆناغەکان ببڕێ و تەواویان بکات.

٣- کەوتن و مانەوەی فەقێ وەکو سیستەمی قوتابی نیە.

٤- مەرج نیە فەقێ مەڵبەندی خوێندنی لێوە نزیك بێت، بەڵکو لەسەرەتاوە ئەم شوێن و ئەو شوێن دەکات.

٥- خوێندن لەحوجره وەکو خوێندنی قوتابیان ئەزمون و تاقیکردنەوەی بەردەوامی نیە (بەتایبەت ئەزموونە وەزارییەکان).

٦- بەزۆری فەقێ لەهەڵبژاردنی مامۆستای ئازادو سەر پشکە، لای ئەم مامۆستا نا لای ئەو.

٧- ئەو هەموو تەعلیماتەی لەقوتابخانە هەیەو پەیرەو دەکرێن لەحوجره کەمن.

# قۆناغەکانی خوێندنی حوجرە

وەکو لەراپۆرتە دەستنووسەکەی مامۆستا مەلا محمد صالح مەلا عمر ئۆمەر گومبەتی دا دەرکەوت، ئەو راپۆرتەی لەشاری کەرکووك نووسیبووی لەرۆژی (٢/٦/٢٠٠٦) بەدەستم گەیشت. ئەو زاتە قۆناغەکانی بەم شێوەیە داناوە

١- قۆناغی یەکەم، کوتابی- قوتابی

٢- قۆناغی دووەم، سوختەیی

٣- قۆناغی سێیەم، ناسکە موستەعید (المقدمات)

٤- قۆناغی چوارەم، موستەعیدی تەواو

٥- قۆناغی پێنجەم، دووا مادەکان (آخر المادة)

سەرەڕای ئەم قۆناغانە، هەندێ جار فەقێ بەهۆی نەبوونی جێگاو رێگا، ماوەیەك بە (مستمع)[1] دادەنرا تاکو جێگا دەبوو ئەوسا دەبووە فەقێی تەواو. مەرج وابوو، هەموو فەقێیەك ئەو قۆناغانە، یەك لەدوایی یەك ببڕێ ئەوسا شایانی بڕوانامە پێدان دەهات:

## ١- قۆناغی کوتابی:

قوتابی لەسەرەتاوە لە (سیپارە)وە دەستی پێدەکرد پاش تەواوکردنی سیپارەو ناسینی پیتەکان، دەچووە سەر خوێندنی قورئانی پیرۆز لە (جزء عمی)وە دەستی پێدەکرد، هاوکات مەرج بوو ئەم کتێبانەش تەواو بکات:

١- کتێبی عەقیدەی کوردی.

٢- کتێبی مەولوود نامەی کوردی.

٣- کتێبی الأحمدية.

٤- کتێبی گوڵستانی، حافیزی شیرازی.

---

1- مستمع= سماعی: بۆی نەبوو سەر بناتە سەر مامۆستاوەو پرسیاری ئاراستە بکاتو ئامادە بوونیش لەدەرسەکان گرنگ نەبوو.

٥- لەهەندێ ناوچە کتێبی (پەندی عەتار- عطار)یش کەدانانی خواجە حافیز بوو پەیڕەو دەکرا.

وەکو مامۆستای ناوبراو لەراپۆرتەکەی ئاماژەی بۆ کردووە، پێویست بوو فەقێیان هەندێ شارەزایی لەبارەی زمانی (عەرەبی[1] و تورکی و فارسی)شەوە پەیدا بکەن بەتەواوکردنی ئەم بابەتانە، قۆناغی یەکەمیش تەواو دەبوو.

## ٢- قۆناغی سوختەیی:

دەرچووانی قۆناغی یەکەم بە (سوختە) ناو دەبران و، هەر چی سوختەش هەبوو بەیەك چاو سەیر دەکران و وەکو یەك مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا، دەردەسەری فەقێ لەم قۆناغەوە دەستی پێدەکرد، بەناچاری لەهەر ناوچەیەك مەدرەسەی باش هەبووایە دەچووە ئەوێ (بوخچەو پریاسکەی) خۆی دەپێچایەوەو بەرەو ئەوێ ملی ڕێگای ەگرت.

لەو ڕۆژەوە بە (فەقێ) ناودەبرا، داب و نەریتی ئەو سەردەمە وابوو، فەقێیەکە بەنامەی مامۆستای قۆناغی یەکەمەمەوە رووی لەمەدرەسەیەك دەکردو ئەگەر جێگایان هەبووایە لەوێ وەردەگیرا، شێوەی نووسینی نامەی نێوان مەلاکان بەم جۆرە بوو

(بۆ بەڕێز مامۆستا مەلا.....

پاش دوعاو سەلام، ئەم فەقێیە لای من کتێب و بابەتەکانی پلەی یەکەمی تەواوکرد، تکام وایە ئەگەر جێگاتان هەیە لای خۆتان بەسوختەیی وەری گرن.. ئیمزا مەلا.....)

کەم وادەبوو فەقێ لەقۆناغی سوختەیی لەنزیك کەس و کاری بخوێنێ، هاوکات سەردانی ماڵی باوکی نەدەکرد تەنها مەگەر لەناچاری و کارەساتێك، لەزۆربەی حوجرەکان، قۆناغی سوختەیی لەم کتێبانەوە دەستی پێدەکرد:

---

1- بە زۆری لە مەدرەسەو حوجرەکانی شاری کەرکوك و دەوروبەری ئەم سیستەمە پەیڕەو دەکرا، لە هەولێر کەمتر.

١- كتێبی (عوامل جرجانی)

٢- كتێبی سعداللەی گەورە

٣- كتێبی سعدللەی بچووك

٤- كتێبی انموذج

٥- كتێبی شرح مغنی محتاج

٦- كتێبی عوامل الدوانی

٧- كتێبی اظهار- مەلا محسن

٨- كتێبی مراح- الارواح

٩- كتێبی مقصود

١٠- كتێبی بناء

١١- كتێبی اظهار البركوی

١٢- كتێبی منوب

١٣- كتێبی فعل سعدالله

١٤- كتێبی الصمدیة

١٥- كتێبی تصریف مەلا علي و قزلەجیو قەرەباخی

١٦- كتێبی الاستعارة

١٧- كتێبی الوضع.

لەقۆناغی سوختەیی لەمەدرەسە گەورەكان، موستەعیدی دووا مادە هەبوو، دەرسی بەهەندێ سوختە دەدا، بەو موستەعیدەیان دەووت (متعلق)[1].

پاش تەواو كردنی بابەت و كتێبەكانی سەرو، سوختە ئەم قۆناغەشی دەبڕیو دەچووە قۆناغی ناسكە موستەعیدی.

## ٣- پلەی قۆناغی موستەعیدی

**أ- ناسكە موستەعید**

---

1- بڕوانە لاپەرە (٢٨) لەكتێبی (ژیانی فەقێیەتی لەكوردستان) لەدانانی مامۆستا مەلا محمد علی عەلیاوەو سەرپەرشتی د.عبدالله سالی/ ٢٠٠٣.

سەرەتای ئەم قۆناغە لەکتێبی (جامی)وە دەستی پێدەکرد پاشان دەبووایە هەر لەو قۆناغە ئەم بابەتانەش تەواو بکات:

١- کتێبی الفتاوی.. قول احمد.

٢- کتێبی عبداللەی یزدی.

٣- کتێبی شرح الشمسیة ومغنی الطلاب.

٤- کتێبی السیوطی وابو طالب.

٥- کتێبی الشافیة وسلم المنطق.

زۆرجار بۆ تەواوکردنی ئەم قۆناغە، فەقێ پەنای دەبردە بەر حوجرەیەکی دی، هاوکات هەندێ لەهەڵسوکەوتی دەگۆڕا لەوانە:

١- لەبەرکردنی (کەواو چاکەت، یان کەواو سەڵتە).

٢- بەستانی جامانی گولەنگ و ریشودار.

٣- خۆ بەپاك و خاوێنی ڕاگرتن.

٤- بەردانەوەی تەنکە ردێنێك، ئەویش بەکەمی.

فەقێ تاکو کتێبی (الشمسیة)ی تەواو دەکرد هەر بەناسکە موستەعید دادەنرا.

ب- موستەعیدی تەواو:

پاش تەواوکردنی پلەی یەکەم، دەچووە پلەی دووەم و بەموستەعیدی تەواو ناودەبرا، لەم قۆناغەش وەکو قۆناغی پێشوو، هەندێ بەرەو پێشەوە دەچوو، هەڵسوکەوتی دەگۆڕا، وەکو

١- نوێژکردن بەجەماعەت (کۆمەڵ).

٢- سیواك بەکارهێنان.

٣- عەبا لەشان کردن.

٤- لەجیاتی مامۆستا بەدەنگەوە چوونی خەڵکی، بەشداری ئاهەنگ و بۆنە خۆش و ناخۆشەکان.

٥- هەڵگرتنی خەنجەرو دەمانچە.

لەکتێبە دیاری کراوەکانی ئەم پلەیە، ئەمانە بوون:

١- كتێبی (انوار مەزن، گەورە) فیقهی ئیمام شافعی.

٢- کتێبی شرح المنهج فیقهی ئیمام شافعی.

٣- کتێبی البیضاوي تەفسیری قورئان.

٤- کتێبی المدارك تەفسیری قورئان.

٥- کتێبی البوخاری شەرحی فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ).

٦- کتێبی ابن الحجر فقهە.

٧- کتێبی الفرائض لەبارەی دابەشکردنی میراتەوەیە.

٨- کتێبی گلنبوی ئاداب شەرحی (پێنجوینی و قەرەداخی)یە.

٩- کتێبی رسالة الحنفي المنبهر.

١٠- کتێبی قوشجی لەبارەی- الوضع.

١١- کتێبی عصام الدین لەبارەی بیان.

١٢- کتێبی کمال الدین لەبارەی صرف، اشتقاق، اعلال.

١٣- کتێبی سەید عبداللە.

١٤- کتێبی ارشاد العباد الی سبیل الرشاد.

١٥- کتێبی ریاض الصالحین.

١٦- کتێبی منهاج الطالبین.

١٧- کتێبی فتح المعین.

## ٤- قۆناغی دووا مادەکان

ئەم قۆناغە بەدووا قۆناغی خوێندنی مەلایەتی لەقەڵەم دەدراو بەتەواوکردنی، فەقێ کۆتایی بەخوێندن دەهێناو کاتی بڕوانامە وەرگرتنی دەهات.

لەکتێبەکانی:

١- کتێبی (شرح الشمسیة) لەگەڵ حاشیەکەی.

٢- کتێبی گلنبوی برهان.

٣- کتێبی شرح العقائد

٤- کتێبی میر ابو الفتح.

٥- کتێبی جلال الدين الدوانی.

٦- کتێبی المطول

٧- کتێبی جمع الجوامع.

٨- کتێبی القاضي مع تعليقات لاری

٩- کتێبی تهذيب الكلام.

١٠- کتێبی التشريح.

١١- کتێبی شرح الجغمينی[1]

١٢- کتێبی خلاصة الحساب

١٣- کتێبی الاسطرلاب

١٤- کتێبی ربع المجيب والمقنطر

١٥- کتێبی اشكال التاسيس

١٦- کتێبی شرح المطالع

١٧- کتێبی شرح المواقف.

١٨- کتێبی شرح المقاصد.

١٩- کتێبی شرح الطوالع.

٢٠- کتێبی التلويح

٢١- کتێبی مختصر المنتهي.

پاش بەسەربردنی زیاتر لە (٢٥) دانە ساڵ لەخوێندن، فەقێ دەگەیشتە قۆناغی کۆتایی و بڕوانامەی مەلایەتی وەردەگرت.

---

1- لەکاتی تاوتوێ کردنی ئەم بابەت و کتێبانە لەگەڵ مامۆستا عبداللطيف میرانی، ئیمام و خەتیبی مزگەوتی اسماعيل يعقوبی لەهەولێر، دەری بڕی ووتی (هەندێ لەو کاتێب و سەرچاوانە لە حوجرەکانی کوردستان پەیڕەو نەدەکران).

# پلەو پایەی زانایانی ئایینی
# لەرووی زانستەوە

هەموو ئەوە چاکدەزانین کەخوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾.

واتە هەر چەندێ شارەزابی لەبوارێك، لەوانەیە کەسانێك هەبن لەتۆ زیاتر لەو بووارە شارەزاتر بن هەر ئەم هۆیە بوو، کەزانایان بگەنە ئەم چەند پلەیەوە:

١- زانای مجتهد[1].

٢- زانای موفتی.

٣- زانای مودەریس.

٤- مەلای تەواو.

٥- کۆلکە مەلا.

بەزۆری ووشەی (مجتهد) بەو کەسە دەوترێ کەشارەزایەکی تەواوی لەهەر چوار مەزهەبەکە هەیەو توانای رێنمایی کردنی خەڵکیان هەیە.

## جۆرەکانی مجتهد

### أ- مجتهدی مطلق:

ووشەی (مجتهدی مطلق) بەو کەسانە دەڵێن کەشارەزایی تەواویان لەرێزمانی عەرەبی هەیە، بەتەواوی ئاگاداری فەرموودەکانی خواو پێغەمبەری خوان، شارەزاییان لە (اصول الفقة) و (رای الاجماع)یش هەیە، کەسێك بێ توانای هەبێ بەپێی شەرع، رێنمایی خەڵکی بکات.

---

1- بڕوانە لاپەڕە (١٣٤) لەکتێبی (فەقێ و فەقێیەتی لەکوردستان) نووسینی مامۆستا مەلا سەید مصطفی سەید محمودیان- ئێران.

## ب- مجتهد في مذهب[1]:

بەو زانایە دەڵێن کەشارەزایی تەواوی لەیەکێ لەمەزهەبەکان، یان هەر چواریان هەبێ، بۆچوون و رێنمایەکانی لەسنووری ئەو مەزهەبانە نەترازێ.

## ج- مجتهد الفتيا:

بەو زانایانە دەڵێن، کەچارەسەری کێشەیەك دەکەن، کە لەشەرعا چارەسەری بۆ دیاری نەکرابێ، واتە هەر گرفتێك چارەسەری لەشەرعا نەبێ، (موفتی) بۆی هەیە بڕیاری گونجاوی بۆ دەرکات.

## د- مودەریس:

بەو زانایانە دەڵێن کەسەرقاڵی دەرس ووتنەوەن و رەوشێکی باڵایان لەو بوارە هەیە، چ لەحوجرە بێ، یان مەدرەسەگەورەکان.

## هـ- مەلای تەواو:

بەو زانایانە دەڵێن کەشارەزایی تەواویان لەبنەما سەرەکییەکانی ئەم ئاینە هەیەو جێگای موتمانەی خەڵکین.

## و- کۆلکە مەلا:

بەو مەلایانە دەڵێن کەهەندێکیان لای حوجرە خوێندووە بەڵام تەواویان نەکردووە، تەنها لەئەرکە سەرەکییەکان وەکو ئیمامەتی و هاوشێوەکانی دەم دەکوتن.

* * *

1 – أ–مذهب الامام الشافعي. ب– مذهب الامام الحنفي. ج– مذهب الامام المالكي. د– مذهب الامام الحنبلي.

# ڕێوڕەسمی بڕوانامە وەرگرتن

وەکو لەمەوپێش ئاماژەمان بۆ کرد، پاش بەسەربردنی نزیکەی (٢٥) ساڵ تەمەن لەحوجرەو ناو فەقێیان، لای ئەم زاناو ئەو زانا، فەقێ کۆتایی بەبڕگەکانی خوێندن دەهێناو کاتی ئەوە دەهات کەبڕوانامەی (١٢) عیلمی وەرگرێ، بەچەند مانگێك بەر لەکات و ساتی بڕوانامە بەخشین، مامۆستاو فەقێ، تێکڕا دەکەوتنە خۆسازدان و ئامادەباشی. بۆ ئەوەی ئاهەنگی بڕوانامە وەرگرتن بەشێوەیەکی پوختە ئەنجام بدرێ، دەیان نەخشەیان دەکێشا، هەوڵی دابین کردنی پێداویستی ئاهەنگەکە دەدرا، هەندێکیان لەتەقەلای هەواڵ ڕەوانەکردن بوون بۆ کەس و کاریان بۆ ئامادەو بەشداری کردن، هەندێکیان دەکەوتنە ناونووس کردنی ئەو کەسانەی کەبڕیار وابوو بەشداری لەو ئاهەنگە بکەن. پاش دەیان تەقەلا، کات و سات و شوێنی ئاهەنگەکە دیاری دەکرا.

# ئەو جۆرە ئاهەنگانە چۆن بەڕێوە دەچوو؟

بەزۆری دووا مامۆستای موستەعیدەکە، ئەرکی بڕوانامە پێدانی لەئەستۆ دەگرت، جاروا دەبوو لەیەك ئاهەنگ دا (٣- ٤) موستەعید بڕوانامەیان وەردەگرت.

# هەلومەرجی ئەو ڕێوڕەسمانە

ئەو بۆنانەش، وەکو هەموو بۆنەیەکی دی ناو کۆمەڵ، چەندین هەلومەرج لەخۆ دەگرت. بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، چەندین خاڵ ڕەچاو دەکراو بە پەیڕەوی بۆنەکە لەقەڵەم دەدرا، لەوانە:

١- دیاریکردنی کات و ساتی ئاهەنگەکە.

٢- دابەشکردنی کارتی (داوەتنامە) بەسەر ئەو کەسانەی کەهاتنیان بۆ وەها ئاهەنگێك گرنگ بوو.

٣- بەشداری کردنی شێخ و پیاو ماقوڵ و ئاغاو ردێن سپی لەو ناوچانە.

٤- ئامادەبوون و بەشداری کەس و کاری فەقێیە دەرچووەکان.

٥- بەشداری تەواوی مامۆستاو فەقێیەکانی ئەو دەڤەرە.

٦- سازدانی خۆراك و پێویستی وەها ئاهەنگێك.

ئەم خالآنەو دەیان خالی دی، بەر لەسازدانی ئاهەنگەکە دەبووایە کاریان بۆ بکرێو بەپێی توانا داین بکرێن.

# برگەکانی رێورەسمەکە

لەسەرەتاوە، یەکێ لەفەقێ دەنگ و ئاواز خۆشەکان بە (عشره)یەك لەقورئانی پیرۆز کردنەوەی ئاهەنگەکەی رادەگەیاند پاشان مامۆستای (مجیز)[1] بەو بۆنەیەوە ووتارێکی دوورو درێژی پێشکەش بەئامادەبووان دەکرد، لەوتارەکەیدا، ئامارەی بۆ چەند خالێك دەکرد لەوانە:

١- بەرز نرخاندنی زاناو زانست لەرووی ئایینیو کۆمەلآیەتیو روناکبیریەوە.

٢- دەربرینی سوپاس و پێزانینی خۆی بۆ ئەو کەسانەی کەیارمەتی تەواوی حوجرەو مەدرەسەکەیان داوە.

٣- هاندانی ئەو خەلکە بۆ رەوانەکردنی مندالەکانیان بۆ حوجرە بەنیازی خوێندەواری.

٤- راگەیاندنو ئاشکرا کردنی بەزانا بوونی ئەو کەسانەو بروانامە وەرگرتنیان و گرنگی رێز لێگرتنیان.

سەرەرای ئەم خالآنە، ووتاری مامۆستا، هەندێ لایەنی دی تاوتوێی دەکردو بەرز دەینرخاندن. پاش ووتاری مامۆستا، یەکێ لەفەقێیە بەتواناکان وەکو نوێنەری فەقێیەکان ووتارەکی دەخوێندەوە لەدەقی ووتارەکەی دا سوپاس و پێزانینی خۆیو هاورێیەکانی ئاراستەی مامۆستاکانی دەکردو پەیمانیان دەدانێ کە لە ئەرکەکانیان کەمترخەم نەبنو بە دلسۆزانەوە ئەنجامی بدەن.

---

1- بەو مامۆستایە دەلێن کەبروانامەکان ئیمزا دەکات و مۆری خۆی پێوە دەنا، دوورا مامۆستا موستەعیدەکەیە.

پاش ماوەیەك حەسانەوە، دووبارە بڕگەكانی ئەو ئاهەنگە دەستی پێدەكردەوە لەبڕگە خۆشوو سەرنج ڕاكێشەكانی ئەم ئاهەنگە، بڕگەی (شانۆ گەرییە)[1] لەكۆنەوە، لەم بۆنانە بڕگەی شانۆگەری پلەو پایەیەكی بەرزی هەیە، لەشانۆگەرییە بەناو بانگەكانی (شانۆگەری مەلاو مەلا ژن، شانۆگەری كەرو ئاشەوان، دكتۆری چاو) دووا بەڕگەی دابەشكردنی بڕوانامەكان بوو.

## ئەركی ئەو ئاهەنگە لەئەستۆی كێبوو..؟

بەزۆری، پیاو ماقوڵ و ئاغاو برا گەورەی ئەو دەڤەرە، تەواوی پێداویستییەكانی دابین دەكرد، هەر لەخواردن تاكو دەگاتە (جبەو عەمامەی) مەلا دەرچووەكان.

بەم شێوەیە ڕێز لەزانایانی ئاینی دەگیرا. بەم جۆرە هەڵسوكەوتیان لەگەڵ دەكرا، بەم هەرەوەزیو هەمە ئاهەنگییە خۆشحاڵیتان بۆ دەردەبڕا.

بەداخەوە، ئەو هەموو ڕەفتارو نەریتە جوانانە، بەرەو لەناوچوون دەڕۆن، بەتایبەتیش پاش پەیدابوون و سەرهەڵدانی خوێندن لەقوتابخانە فەرمییەكان.

## داب و نەریتی بڕوانامەی مەلایەتی

دابەشكردنی بڕوانامەی مەلایەتی، لەكۆنەوە لەسەر یەك ڕێچكە دەڕوات. بەتەواوبوونی بڕگەكانی ئاهەنگی دەرچوون، مامۆستای (مجیز) پاش بەرز هەڵسەنگاندنی بڕوانامەی مەلایەتیو هاندانی خەڵكی بۆ ڕەوانەكردنی منداڵەكانیان و ڕێزگرتن لەو مەلا تازە پێگەیشتووانە، ئاماژەی بۆ بڕوانامەكەی خۆی دەكرد، كەی

---

1 - مامۆستای روناكبیر، كاك شێخ عبداللە شێخ بابا علی شێخ مصطفی-ی بەرزنجی، لەم بارەیەوە دەڵێ (بەلای منەوە، بیرۆكەی شانۆگەریو سەرهەڵدانی لەكوردستان زۆر كۆنترە بە بەراورد لەگەڵ عەرەب، سەرەتای پەیدابوونی بۆ ئەو ئاهەنگانە دەگەڕێتەوە، بێدەنگی زانای ئایینی لەوەها نمایشێك، مانای ڕەزامەندیان دەردەبڕی لەسەر ئەم بەشە لەهونەرە).

وردی گرتووه...؟ کێ بوو ماموٚستاکەی..؟ دەست بەدەست تاکو دەگەیشتە سەرچاوەکەی کەلەمەو پێش ئامارژەمان بۆ کرد.

بۆ بەڵگە، پاش کۆپی کردن، وا بڕوانامەی ماموٚستا مەلا خدر مەلا ئیبراهیم شەمامەریتان لەگەڵ ئەم بابەتە هاوپێچ دەکەین، ئەو بڕوانامەیەی کە لەساڵی (١٩٤٣) لەسەر دەستی خوالێخۆش بوو جەنابی شێخ مصطفی شێخ ابوبکر نەقشبەندی هەرشەمی وەریگرتووە هاوکات مۆری پەسەندکردنی ئەوقافیشی پێوەیە کە لەبەرواری (١٢/١٠/١٩٧٨)دا بینراوە.

یان بڕوانامە خوالێخۆشبوو ماموٚستا مەلا عبدالله مەلا قادر باداوەیی کە لە ١/٤/١٩٤٠ لەسەر دەستی زانای ناوداری کورد خوالێخۆشبوو ماموٚستا مەلا صالح کۆزەپانکەیی وەریگرتووە.

# بڕوانامەیەکی کۆنی کۆپی کراو

(١)

بسم الله الرحمن الرحيم وبه نستعين

الحمد لله الذي شرح صدور العلماء الأبرار بأنوار البينات وانتزع
عن قلوبهم صدأ الشكوك والشبهات ورفع بعضهم فوق بعض درجات
وجعل لهم من لدنه سلطانا نصيرا وفتح عليهم أبواب كنوز المعاني
وخزائن البيان وخصصهم ببدائع الأيادي وروائع الإحسان.
فصرفوا جهدهم في كشف القناع عن كلامه تأويلا وتفسيرا وأخذوا منهم أصول
شريعته الغراء وأيدهم في ترويج الحنيفية البيضاء يؤتي الحكمة من يشاء ومن
يؤت الحكمة فقد أوتي خيرا كثيرا فسبحانه من أسس مبادئ الدين
على الكتاب والسنة وأوضح للناس بالحجج البالغة محجة الجنة وكتب
في أوراق الأطباق آيات توحيده ليتدبروا بها ويتفكروا فيها تفكيرا فيا من
تجلت لعزة جلاله جباه الأجرام العلوية ونطقت بشكره ألسنة الأنوار
القدسية . صل على من أرسلته بالهدى ودين الحق بشيرا ونذيرا فهدى
إليك بعد ما وقب غاسق الجهالة وقاد إلى جنابك حيث انتقبت محجة
الهدى بظلم الضلالة سيدنا ومولانا محمد الذي نورت الآفاق والأنفس
بمقدمه الشريف تنويرا وعلى روح … ساء(؟) مظاهر القدس وعظائم … الأ
نس من آله وأصحابه المضيئة لقيامهم على الإخلاص والمنادين
عن وضعهم العام إلى وضعهم الخاص الذين تأدبوا بآدابه وقرروا
أحاديثه بتصحيح المنطق تقريرا . أما بعد فأقول
إن العلم لواء قدره مرفوع لا يوضع وأساس عزه موضوع لا يرفع

من اعتصم به فلا يضل ولا يشقى ومن اعرض عنه فهو خسر الدنيا والآخرة
يقيني وان من اهتدى بنور الله الى الصعود في مدارج هذه الرتبة دون
اقرانه ويجل عليه انجم الصعود في رصد النظر الى هذه المنقبة دون
اخوانه نافل هذه النخبة وحامل هذه الوثيقة العالم العامل والفاضل الكا
مل الجامع من المحاسن اشتاتها والحاوي من المكارم رفاتها كاشف اسرار
العلوم برأيه الصائب جامع دقائق الرسوم بفكره الثاقب
جمال الدين خضر ولد ابراهيم الشمالي عليه رحمة الملك العلام قد بذل
شطرا من ايام دهره وصرف معظم ريعان عمره نحو اقتناء شوارد الرسوم العقلية
واجتناء فرائد العلوم النقلية وطوى رداء شبابه لاطراز الفنون
وجاب مفاوز الشدائد للوصول الى الذي تلمس ثم صاحبنا مدة مديدة
وازمنة عديدة واشتغل فيها عندنا بقراءة كتب معتبرة مطولة ومختصرة
حتى تحقق لدينا انه عرج معارج التحقيق وارتقى على سنام مدارج التدقيق
وقد التمس من الفقير المعترف بالذنوب والحقير المقترف للخطايا والعيوب
ان يجيزه بتدريس العلوم ونشر الرسوم وذلك من حسن ظنه وان كنت لست
اهلا لان الحق بالعلماء في علم من العلوم وفن فسارعت لسؤاله وبادرت
الى تحقيق آماله رجاء الانتظام في سلك العلماء الابرار وعملا بما ثبت
في علوم الحديث من رواية الاكابر عن الاصاغر فاجزت له ان يدرس
فرائد العلوم من الفروع والاصول وبسط موائد الرسوم من المنقول والمعقول
وشهدت له بالفضل التام وانه حقيق لان يعد من الاعلام بشرط

بشرط أن يراعي الشفقة على الطالبين ويداوي قواعد الرحمة في التعليم والتحصيل
كما أجازني رديف المتقدمين وأكمل المتبحرين الجامع بين الكمالات الصورية
والمعنوية صاحب الأنفاس القدسية ومحيي السنن المصطفوية الإمام
الرباني والعارف الصمداني مربي السالكين ومرشد الناسكين شيخي ووالدي
الشيخ أبو بكر الملقب بغياث الدين قدس الله سره وروحه ونفعنا ونور
ضريحه ورمسه والفاضل الكامل والحبر الكامل نتيجة المتبحرين نخبة الفضلاء
والمتقدمين خاتمة العلماء المتأخرين أبو بكر أفندي المشهور بچلي ملا
[وختم الله] في الدارين وأعلا درجاته هو عن والده الفاضل العالم والإمام
الباهر الجامع بين علم الباطن والظاهر عمر أفندي الأربلي عليه رحمة الملك
المعين وهو قرأ على العالم العامل والفاضل الكامل عمر أفندي الخيلاني [عليه
لطف الرباني] وأخذ والده الإذن والإجازة من والده نخبة المتقد
مين ومحيي شريعة سيد المرسلين صلى الله عليه وسلم العالم التقي والفاضل النقي
الملا محمد الرشي عليه رحمة الملك القوي وهو قرأ على الفاضل التقي
والعالم النقي نخبة المتقدمين وفخر المتأخرين أبي بكر أفندي الأربلي
عليه رحمة الملك العلي وعلى إمام الآفاق بالاتفاق أستاذ الكل في الكل
على الإطلاق نظريف المتأخرين وأكمل المتبحرين ناقد السابقين ودوانه
اللاحقين العالم الرباني محمد أفندي الخطي ابن الشيخ سليمان [عليه لطف
السبحاني] وهو قرأ على المولى الفاضل الكامل والعالم العامل عبد الرحيم
أفندي الزيارتي [عليه رحمة الملك الباري] وعلى المولى العلامة والحبر

العلامة نتيجة المتبحرين وخاتمة المتأخرين أستاذ الكل عبد الرحيم
افندي الروشنداني عليه اللطف الرباني [ وهما قرأ على العلامة صبغة الله
افندي الزياري نور ضريحه الملك الباري ] وهو على مولانا صالح الحنفي
الحيدري الصفوي عليه رحمة الملك القوي وهو على والده العلامة
مولانا اسماعيل عليه رحمة الملك الجليل ] وهو على والده العلامة ذي
القلب السليم مولانا ابراهيم وهو على والده صاحب التصنيفات
الفائقة والتأليفات الرائقة الذي فاق في العلوم وشهر الكردي
الحيدري مولانا حيدر وهو على والده الذي بمآثره العلمية
لا يزال يحمد مولانا احمد وهو على والده مجمع جامع المنطوق و
المفهوم مولانا حيدر الأول المرحوم تلميذ شيخ نصر الله الخلخالي تلميذ
خواجه جمال الدين محمود الشيرازي تلميذ المولى المحقق جلال الملة
والدين محمد بن سعد الصديقي الدواني تلميذ محي الدين الكلشاني
تلميذ العلامة الشريف الجرجاني [ قدس سره ] تلميذ مبارك شاه تلميذ
المحقق قطب الدين الرازي تلميذ العلامة الشيرازي تلميذ نصير الدين
الطوسي وكان ايضا تلميذ للكاتب القزويني تلميذ الامام فخر الدين
الرازي تلميذ حجة الاسلام محمد بن محمد الغزالي تلميذ امام الحرمين
عبد الملك بن عبد الله بن يوسف الجويني تلميذ الشيخ أبي طالب المكي وهو
أخذ الإنابة والإرادة ولبس الخرقة من أبي عثمان المغربي وهو من
ابي عمرو الزجاج وهو من برهان الملة والدين سلطان الحقيقة واليقين

واليقين مروج الشريعة الغراء ومحي الطريقة البيضاء سيد الطائفتين
أبي القاسم الجنيد البغدادي قدس سره وهو من خاله ولي الله على التحقيق
ومبين مناهج الحقيقة لأهل الطريقة أبي الحسن السري ابن المغلس
السقطي قدس سره وهو من تاج الأولياء وارث علوم سيد الأنبياء
الشيخ معروف الكرخي قدس سره وهو من أبي سليمان داود الطائي قدس سره
وهو من حبيب العجمي قدس سره وهو من الحسن البصري رضي الله تعالى عنه
ومن صاحب علوم الإمام الهمام والليث المقدام غوث المحققين يعسوب المو
حدين سراج الملة والدين شمس العالمين بدر العارفين الشارب الكأس
اليقين علي ابن أبي طالب القرشي الهاشمي (كرم الله تعالى وجهه) ورضي
الله تعالى عنه) وهو من حضرة درة صدف الوجود وواسطة عقد
المرسلين المخصوص بالمقام المحمود خليفة الله الأعظم وسر وجود الأفلاك
المخاطب بلعمرك لولاك لولاك لما خلقت الأفلاك سيدنا ومولانا
(محمد المصطفى صلى الله عليه وسلم) وعظم وشرف وكرم وهو من أمر ذي النور
المبين بواسطة الروح الأمين المتمكن بين الملائكة المقربين برسالة
رب العالمين جبريل عليه السلام ولبس الجنيد أيضا الخرقة وأخذ الإذن
والإنابة والنسبة هو من جعفر الحداد من عبد الله الأصطخري من
أبي تراب النخشبي من شقيق البلخي من إبراهيم بن أدهم من موسى الراعي
من سيد التابعين صلاحا وزهدا أويس القرني رضي الله تعالى عنه وهو من أمير
المؤمنين القامع لزيغ المخرلين

الفارق بين الباطل والحق المبين عمر بن الخطاب وعلى ابن ابي طالب
المتضلع من رحيق حق اليقين [رضي الله عنهما] مبادا الإدراك
معرفات ومقاماته صلى الله عليه وسلم وهو صلى الله عليه وسلم تلقى كتلقي عن جبريل
عليه الصلاة والسلام وجبريل تلقى عن الحق تبارك وتعالى جل جلاله
وعم نواله وقرأت على مشايخنا اصحاب الكمالات احمد بن حيدر الفاضل
الله علم ثابت ارجحات مشكاة المصابيح الى باب الاعتصام بالكتاب
والسنة على الشيخ شهاب الدين احمد بن محمد بن حجر المكي الهيتمي تلميذ
شيخ الإسلام القاضي زكريا الأنصاري تلميذ جلال المحلي تلميذ جلال
البلقيني تلميذ امير المؤمنين في الحديث شارح الصحيح البخاري
الحافظ بن حجر العسقلاني اللهم اجعل هذه الاسانيد متصلة بحبلك
المتين الذي لا ينقطع وحصنا بحصنك الحصين الذي لا يضيع
واجعل هذا العمل خالصا لوجهك ووسيلة للوقوف بين يديك
يثبت الله الذين آمنوا بالقول الثابت في الحيوة الدنيا وفي الآخرة
اللهم أفض علينا من بركاتهم واسلك بنا مسالك كراماتهم واغفر لنا
بجاههم آمين والحمد لله رب العالمين وصلى الله تعالى على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه
اجمعين ـــ امر بتحريره واذن لما طلب منه واجاز بجميع ما يجوز له خادم العلم
والمصلين واحباب الورع والسالكين لمعرفة الحق المبين ـــ المجيب

التاريخ ١٩٤٣



« الاجازة العلمية »

التاريخ ١/٩/١٩٥٢
العدد / ٩ /

| اسم الطالب | تاريخ انتمائه الى المدرسة | العلوم و الكتب التي تدرسها الطالب خلال الدراسة الدينية في هذه المدرسة . | صورة الطالب الشمسي |
|---|---|---|---|
| ... ملا قادر ... قرية بادراوا ... ناحية مركز اربيل | ١٩٤٠م | ابن عقيل مغني اللبيب وشرح الجامي في النحو و شرح الشافية في الصرف شروح الشمسية وايساغوجي في المنطق ، كلنبوي في آداب البحث ، مختصر ومطول في البلاغة شرح المنظومة في علم العروض والقوافي ، تفسير النسفي و شرح الهداية والمنهاج في الفقه ، شرح التوضيح وجمع الجوامع في اصول الفقه ، و بلوغ المرام و شرح مختصر البخاري الشرقاوي في الحديث ، شرح نخبة الفكر في مصطلح الحديث وشرح التهذيب الكلام وشرح المواقف في الكلام والتوحيد الرحبية في الفرائض واحياء العلوم للغزالي في الاخلاق ولباب الخيار المختار في السيرة النبوية وبداية المجتهد لابن رشد في الفلسفة الاسلامية . | |

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وحده . و الصلاة والسلام على من لا نبي بعده وعلى آله وصحبه التابعين رشده اما بعد .

السيد ... ملا قادر البادراوي العراقي الجنسية والملصق صورته اعلاه قد لازم مجالس اساتذتنا وواظب على دراسة العلوم الدينية والعربية في هذه المدرسة مدة اثني عشر عاما واكمل ... المقرر واجتاز الامتحان النهائي للعام الدراسي ١٩٥١ — ١٩٥٢ للاعتراف بإكماله الدراسة الدينية والعربية واجازته التدريس ونشر العلوم في المدارس الدينية والعربية زودناه بهذه الشهادة ... تحريراً في ٢ محرم ١٣٧٢هـ الموافق ١/ايلول/١٩٥٢م

مدرس مدرسة الشيخ نورالدين للعلوم الدينية العربية في ...
محمد صالح الكوزبانكي

نصادق على محتويات هذه الشهادة وحيازة المومأ اليه بهذه الاجازة العلمية .

| رئيس المجلس العلمي | العضو | العضو | مأمور اوقاف اربيل |
|---|---|---|---|
| الاستاذ يونس المجد الزهاوي | الاستاذ عبدالله ... | الاستاذ محمد رشاد المفتي | محمد علي آل الخليفة |
| قاضي محكمة الشرعية اربيل | المدرس بجامع الحاج قادر | المدرس في جامع القلعة | |

بڕوانامەی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبداللە عبدالقادر باداوەیی

کە لە ڕۆژی ١/٤/١٩٤٠ لەسەر دەستی مامۆستا مەلا صالح کۆزەپانکەیی وەریگرتووە

## ئەو مەرجانەی کە لەکاتی بڕوانامە بەخشین ڕەچاو دەکران چیێ بوون

کۆمەڵێك بنەما هەبوو، مەرج بوو لەکاتی خۆیدا بەدیبێن، تاکو بڕوانامەکە شێوەی ڕەسەنایەتی وەرگری لەوانە:

١- یەکەم مەرجی ئەم هەنگاوە، دەبووایە مامۆستای مجیز خۆی مجاز بووایە، واتە شەهادەی مەلایەتی هەبیّ. ئەوسا بۆی هەبوو ئیجازە بە خەڵکی بدات.

٢- دەبووایە کەسانێك هەبن ئاگاداربن کە ئەو موستەعیدە قۆناغەکانی خوێندنی یەك لەدوایی یەك تەواو کردووە، یان تاقیکردنەوەیەك بکرایە.

٣- ئەو بڕوانامەیە پەسەند بوو کە بەئامادەبوونی جەماوەر بەو مەلا تازە پێگەیشتووە بدریّ، نەك لەلاوە.

## کەی موستەعید پۆشاکی مەلایەتی دەپۆشی دەکرد؟

زۆر لەناوچەکانی کوردستان، لەکاتی بڕوانامە وەرگرتن، واتە لەناو ئەو ئاهەنگە، کاتیّ مامۆستای مجیز لەووتارەکەی دەگەیشتە (اجزت)[1] واتە ئیجازەم بەفلان کەس دا، یەك دووانێك لەهاوڕێیانی ئەو موستەعیدە هەڵدەستان و هەندیّ جار لەبەرچاو خەڵکی ئامادەبووان هەندیّ جار لەپەناوە (جبەو عەمامەو مێزەری سپیان) لەبەر دەکرد بەپۆشاکی مەلایەتیەوە خەڵکی پیرۆزبایی لێدەکرد، هەندیّ جێگاش بڕوانامەکەیان نەدەدایە ئەگەر بەرگی مەلایەتی لەبەر نەکات، واتە بەر لەئاهەنگەکە دەبووایە بیپۆشیّ، بەم شێوەیە.

فەقیّ دەرچووەکان، یەك لەدوایی یەك پۆشاکی مەلایەتیان دەپۆشی و بڕوانامەکانیان وەردەگرت و بۆ پیرۆزبایی دەکەوتنە ناو ئامادەبووان و لەسەرەتاوە بە

---

1- بڕوانە/ ٢١٥ لەکتێبی (فەقیّو فەقێیەتی لەکوردستان) مامۆستا سەید مەصطفی سەید محمودیان، زەمزە میرانی... ئێران. (١٣٨٢- تەهران) ١٩٦٢ز.

(دەست ماچ کردنی) مامۆستاکەیانەوە دەستیان پێدەکرد، بەم شێوەیە ڕێوڕەسمی جل و بەرگی مەلایەتی لەبەرکردن کۆتایی دەهات. زۆرجار ئاغاو پیاو ماقوڵ ئەو جل و بەرگانەی دەکڕی‌و خەڵاتی ئەو مەلایانەی دەکرد.

# بەرزی پلەو پایەی زانای ئایینی لەناو کۆمەڵ

نەك تەنها موسوڵمانان ڕێز لەزاناکانی ئاینی دەگرن و بەس، بگرە تەواوی نەتەوەو ئاینەکان ڕێزی زانایانی ئاینی خۆیان لەلایە.

ئەو پلەو پایەی کەخوای گەورە بەزانای ئاینی داوە، تەنها هەر لەناو ئیسلام نیە، بگرە تەواوی پیاوانی ئایینیەکان لەهەر ئاینێك بن ڕێزیان هەیەو خەڵکی بەو پەڕی ئەدەبەوە لەگەڵیان ڕەفتار دەکەن. ناو کۆمەڵگای کورد، بەهاوسەری مەلاکان دەڵێن (مەلا ژن) و بەنەوەکانیان دەڵێن (مەلا زادە)، ئەم ڕەفتارە حورمەت دەگەیێنێ، ڕێزی تایبەتی دەردەبڕێ.

چینێك خوای گەورە چەندین فەرمووی دەرهەق ووتبێ، چۆن کۆمەڵ بێ ڕێزی لەگەڵ بکات...؟!

لەو فەرموودانە:

١- ﴿هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾... زمر/٩.

٢- ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾.... الفاطر./٢٨.

٣- ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾... انبياء/٧.

٤- ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾... المجادلة/١١.

سەرەڕای ئەمانەش لەدەیان جێگا، پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) زانایان بەرز دەنرخێنێ‌و ڕێزی تایبەتیان بۆ دادەنا دەرهەقیان فەرموویەتی.

لەوانە:

١- (مَن سَلكَ طريقاً يبتغي فيه علماً، سلكَ اللهُ لهُ طريقاً الى الجنةُ، فإن الملائكةَ لتضعُ اجنحتها رضاءاً لطالبْ العلمِ وأن العَالِم ليستغفرَ لهُ مَن فِي السموات ومَنْ في

الأرضْ حتـى الحيتـان في المـاء، وفـضل العـالِم علـى العابـدُ كفـضَل القمـرِ علـى سـائر الكواكبْ).

رواه الترمذي ٨٢/٢٦، جلد/ ٥ ص٤٨

ماناكەی:

هەر كەسێك بەمەبەستی بەزانا بوون، ڕێگایەك بگرێتە بەر، خوای گەورە ڕێگایـەكی بەرەو بەهەشت بۆ ئاسان دەكات، هـەموو مەلائیكەتـەكانیش باڵیـان شـۆڕ دەكەنـەوە بـۆ ڕەزامەنـدی داواكـاری زانـست، زانـا هەرچـی لـەئاسمان و لـەزەوی هەیـە دەپارێتــەوە كەخوا لێی خۆشبێ تادەگاتە نەهەنگ لەناو دەریاش دەپارێتەوە، پلـەو پایـەی زانا بـە بەراورد لەگەڵ خواپەرستێك وەكو پلەو پایەی مانگ و ئەستێرەكان وایە.

ئیمامی ترمزی دەگێڕێتەوە

ژمارە ٨٢/٢٦ بەرگی (٥) لاپەڕە ٤٨

٢- (اكرموا العلماء، فأنهم ورثة الأنبياء، فمن اكرمهم فقد اكرم الله ورسوله)[1].

٣- (العلماء ورثة الأنبياء يحبهم أهل السماء)[2].

٣- (ومن يريد الله به خيرا يفقهه في الدين)[3].

كـەوابوو چـینێك خـوای گـەورە بـەم چـاوە سـەریان بكـات و لەبارەیانـەوە بـدوێ و پێغەمبـەریش (د.خ) بـەجێ گـری خـۆی لەقەڵـەمیان بـدات، كـەی ڕەوایـە خـەڵكی بـەبێ ڕێزییەوە ڕەفتاریان لەگەڵ بكات... كەی؟!

زانایـانی ئـاینی هـەردەم ڕێـزی تایبـەتی خۆیـان هـەبووە، نەتـەوەی كـورد بەهـەموو تواناییەوە خزمەتی زانای كردووە، ئەوان پێشڕەو بوونە، هەڵوەشێنەوەی هەموو گرێی كوێرەیـەك بوونـە، كـەس و كـاری زانایـان، شـانازیان بەنەوەكانیانـەوە كـردووە، هـەر بنەماڵەیـەك زانـای ئـاینی هـەبووبێ، خـەڵكی بەچـاوی پـڕ لـەڕێز سـەبریان كـردوون و ڕەفتاریان لەگەڵ كردوون.

---

1- كتێبی (ارشاد العباد) ص(٩) لە (جابر)وە دەگێڕنەوە.

2- هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە (ابن النجار لە انس) دەگێڕێتەوە.

3

هەر کەسێك ئەم رێچکەیەی گرتبێ، خوای گەورە رێزەکی تایبەتی پێداوه ئەم رێزەش لەسەرەتاوە بووە، هەر لەسەردەمی فەقێیەتی، تاکو دەگاتە مەلایەتیو بگرە پاش ئەوەش. زانایانی ئایینی، رابوێژکاری زۆر کەس بوونە، جێگای درکاندنی نهێنی زۆر کەس بوونە.

* * *

# ئەرکە سەرەکییەکانی زانای ئایینی

ئەو ئەرکانەی لەئەستۆی زانای ئاینییە، ئەرکێکی جیاوازو تایبەتیە، لەوانە:

١- شیکردنەوەی ناوەرۆکی دەقە ئایینییەکان بۆ موسڵمانان.

٢- پێش نوێژیو وتار خوێندنەوەی ئایینی لەبۆنەکان.

٣- سەردان و هات و چۆی خەڵکیو پتەوکردنی پەیوەندیەکانی ناو کۆمەڵ.

٤- بەشداریو ئامادەبوون لەهەموو بۆنەکانی ناو کۆمەڵ.

٥- دەرس ووتنەوەو فەقێ راگرتن و حوجرە بەڕێوەبردن.

٦- بەشداری پرسەو سەر قەبران و شتنو تەلقین کردنی مردو.

سەرەرای ئەم خاڵانەی کەئاماژەمان بۆ کردن، رەفتاری زانای ئایینی بریتییە لەتێکەڵەیەك لەرەفتاری (سەرکردەو برا گەورەو دۆست و دڵسۆزو هەڵوێست بەرز).

* * *

# هەندێ لەداب و نەریتی ناو فەقێیان

چینی فەقێش وەکو زۆربەی چینەکانی تری ناو کۆمەڵ، دەیان داب و نەریتی تایبەتی خۆی هەیە پێویستە فەقێش بەتەولوی رەچاویان بکات و سنوور بەزێنیان لەوانە:

## ١- جل و بەرگ و پۆشاکی فەقێیاتی:

وەکو هەموو ئاگادارین، لەکوردستان، فەقێ لەقۆناغی خوێندن جۆرێ جل و بەرگ دەپۆشێو پاش تەواوکردنی خوێندن و بەمەلا بوونیشی، جۆرێکی دی. بەزۆری واباوە فەقێ تاکو دەگاتە دووا مادەکان، تەنها بەجل و بەرگی کوردی بەسەری دەبا، لەم قۆناغە زۆر حەز لەرەنگی تێر دەکەن، (قاوەیی، رەساسی، بۆر، شین) لەم جۆرە رەنگانە، لەقۆناغی دووا مادەکان دەست دەکەن بە لەبەرکردنی (کەواوو سەڵتە) یان (کەواو چاکەت)، بەڵام کاتێ فەقێ خوێندنی تەواوکردو بڕوانامەی وەرگرت، ئەوسا (جبەو مەندیلی سپی) بەکاردەهێنێ هەشە، دەستێ جل و بەرگی کوردی نایاب دەپۆشێو جبەیەکیشی لەسەرەوە لەبەر دەکات.

## ٢- راتبە کۆکردنەوە:

لەکۆمەڵگای کوردەواری، بەخێوکردنی فەقێیان لەئەستۆی خەڵکییە، بۆ ئەم مەبەستە، رۆژانە چەند فەقێیەك لەسوختەکان، یەك لەدوای یەك دەکەونە ناو ئاوایی لەدەرگاکان دەدەن و بەدەنگی بەرز دەڵێن (راتبەی فەقێیان رەحمەتتان لێبێت) کابانی (کەیبانوی) ماڵ هەر بەگوێ بیستی ئەم چەند ووشەیە، یەکسەر دەزانێ نوێنەری فەقێیەکانەو بۆ بەشە خۆراك هاتووە هەرچی بەدەستەوە بێ فەرامۆشی دەکات، بەبێ دواکەوتن بەشە خۆراکی فەقێیانی بۆ دەهێنێو بەرێزەوە دەیداتە دەستی. بەم شێوەیە هەر سوختەیەك چەند ماڵێکی بۆ دیاری دەکرێو لەکاتی خۆی دەست

بەراتبە کۆکردنەوەی خۆی دەکات و هەرچی خوا بەنسیبی بکات بۆ حوجرە دەبرێتەوە.

## ٣- (شێوازی نان خواردن و قاوەڵتی)

کاتێ کاتی نان خواردن دادێ، هەموو لەسەر یەك خوان کۆدەبنەوە، هەرچی هێنراوە بەریزەوە دادەنرێ ئەوسا هەموویان بە یەکسانی، لەسەر چنچك (ئەژنۆ) یان چوارمشقی لەدەوری خوانەکە دادەنیشن و (بسم الله) دەکەن، زۆر جار وادەبێ لەکاتی بوونی جەمە خۆراکێکی بەلەزەت، بەسیستەمی (یەك لەمن دوو لەتو) دابەش دەکرێ پاش تەواوبوونی خواردن، هەموویان بەهەمەئاهەنگی خوانەکە کۆدەکەنەوەو بەرپرسی قاب و قاچاخ شتن تەواوی هیبارەکان دەشووات.

## ٤- کۆکردنەوەی جومعانە:

رۆژانی هەینی، لەهەموو حوجرەیەك رۆژی پشوو دان و حەوانەوەیە، سەر لەبەیانی رۆژی هەینی، یەك دوو سەعاتێك بەر لەنیوەرۆ، چەند سوختەیەك بەپێی ماڵەکان دەکەوتنە ناو ئاوایی بۆ (جومعانە کۆکردنەوە) هەر یەك لەقۆڵێکەوە ماڵ لەدوایی ماڵ لەدەرگاکانیان دەدەن و بەدەنگی بەرز دەڵێن (جومعانەی فەقێیان بچنە بەهەشتێ) خاوەن ماڵ، هەر کەسێك بەپێی توانا، هەندێ شتی بۆ فەقێیان دەبرد وەکو (شەکرو چایو هێلکەو قەندو رۆن و سابوون) لەرۆژی جومعە بەزۆری ئەم بابەتانە دەدرایە فەقێ، تەواوی جومعانەکە دەبرایەوە حوجرە، ئەگەر لەخۆیان زیاد بووایە، ئەو برە زۆرەی دەفرۆشرایەوەو بەپارەکەی هەندێ پێداویستی تریان بۆ خۆیان دابین دەکرد، لەوانە (پیاڵەو ژێر پیاڵە، چرا، نەوت، کەوچك- مەلاك، قاپ دەوری... تاکۆتایی). هەر هەفتەی جارێك، ئەم جومعانەیە لەخەڵکی ئاوایی یان دەوروبەر کۆدەکرایەوە...

### ٥- سەردانیو.... هاتووچۆ

یەکێ لەڕەوشتە جوانەکانی ناو فەقێیان، سەردانی یەکتر بوو، بەزۆری لەکاتی پشوودان و دەست بەتاڵی، یان لەرۆژانی هەینی، هەندێ جار بەتاکە کەسی، هەندێ جار بەکۆمەڵ، تەواوی فەقێیانی مەدرەسەیەك بۆ سەردانی بەرەو مەدرەسەیەکی دی بەرێ دەکەوتن، جاروا هەبوو شەویش لەوێ دەمانەوە.

لەسوودەکانی ئەم جۆرە سەردانیانە:

١- تاوتوێی کردنەوەی قۆناغەکانی خوێندن بۆ یەکتر.

٢- تاقیکردنەوەی ئاستی خوێندن لەلای یەك.

٣- پتەوکردنی دۆستایەتیو خۆشەویستی لەنێوانیان.

٤- رەوانەوەو لەبیرکردنی خەم و خەفەت و هەناسە ساردی.

٥- بەسەربردنی کاتێکی خۆش بەیەکەوە.

### ٦- (دەرس رەوانکردن)

بۆ رەوانکردنی بەشە دەرسی ئەو رۆژە، زۆرجار پاش نان خواردنی نیوەڕۆ، فەقێ دەکەوتە سەعی کردن، ئەگەر کەش و هەوا خۆشبووایە بەرەو دەرەوە دەچوون، ئەگەرنا، یان لەناو حەرەم یان لەناو حەوشەی مزگەوت دەکەوتنە هاتووچۆ تاکو تەواوی دەرسەکەیان لەبەر دەکرد، زۆرجار بەهۆی زۆری هاتووچۆ رێچکەیەکیان بۆ خۆیان پەیدا دەکردو شوێن پێیان لەو دەشتە دیاربوو.

## رەوشت بەرزی لەناو فەقێیان

فەقێ لەو کاتەوە کەدەچووە حوجرە، لەسەرەتاوە فێری رەوشت بەرزی دەکرا، دەیان بنەماو رێچکەی نوێی بۆ دیاری دەکراو داوای لێدەکرا لەسەری بڕوات و لەژیانی پەیڕەویان بکات، لەوانە:

١- دەست بەردان لەیاریو دەمە سوبعەت و جوندان لەگەڵ مندالآنی تری ئاوایی.

٢- وازهێنان لههەموو جۆرە گەمەیەك كە لەوەزنی كەم بكاتەوە، ئەگەر بەتەنهاش بوو.

٣- ڕێزگرتن لەخەڵكی، بەتایبەت دایك و باوك و پیاو ماقوڵ و لەخۆی گەورەتر.

٤- خۆ دووركرتن لەدرۆو دوو زمانیو خۆ بردنە پێشەوەو بوغرایی (لەخۆبایی بوون).

٥- پارلستنی پاك و خاوێنی خۆیو جل و بەرگەكەی.

٦- پۆشینی جل و بەرگی شیاو، نەك وەكو مندالآن هەرچی دەست كەوت لەبەری كات.

٧- بلأوكردنەوەی خورەوشتی بەرز لەناو خەڵكی.

لەهەمووی سەیرتر، ئەگەر یەكێ لەفەقێیەكان، ناوەكەی ناخۆش بووایە، ئەوا ناوەكەیان دەگۆڕی[1].

# تایبەتمەندێتی پۆشاكی فەقێیان

زۆرن ئەو چین و توێژانەی كەجل و بەرگی تایبەتی خۆیان هەیەو بەهۆی ئەو پۆشاكەوە وەكو هێمایەك لەدوورەوە دەناسرێنەوە. لەسەرووی هەموو ئەو چینانە، زانایانی ئاینین، چ ئاینی ئیسلام، چ ئاینی دیكەی ئاسمانی. بەلأم بەداخەوە، مەخابن بۆ ئەم سەردەمە كە كەسانێك پەیدابوونە ئەو دروشمە جوانە بەلاوە دەنەن، هەوڵ بۆ نەمانی دەدەن. چینی دادوەرو پارێزەرو پۆلیس و سەرباز، تەنانەت قەساب و بەناو فیتەریش، شانازی بەجل و بەرگەكەیەوە دەكات، بەلأم لەوە دەچێ هەندێ لەزانا یاینیەكان ئەم لایەنەیان فەرامۆش كردبێ، یان دەستێك هەبێ نیازی سڕینەوەی ئەم موڵكایەتیە نەتەوایەتیەی هەبێ. بەهۆی جل و بەرگەكانیانەوەیە خەڵكی بە (مامۆستا) بانگیان دەكەن، ئەوە نەبێ بەهەندێكیان دەڵێن (مامەو بەهەندێ وەستا) بەبۆچوونی من لادان لەپۆشاكی رەسەنی مەلایەتی، مەبەستێكی شاراوەی تیادایە.

---

1- بڕوانە لاپەرە (٢٤) لەكتێبی (ژیانی فەقێیایەتی لەكوردستان) لەدانانی مامۆستا مەلا محمد علی عەلیاوە. هەولێر- ٢٠٠٣.

# هەندێ لەیاریەکانی فەقێیان

فەقێش وەکو چینەکانی تری لاوان، لەکاتی دەرفەت و دەست بەتاڵی پەنایان بۆ هەندێ یاری شیاو دەبرد، چ وەکو وەرزشێك، چ بۆ بەسەربردنی کات و خۆ خافلاندن. یارییەکانی شەوانیان بەبەراورد لەگەڵ یاری رۆژ جیاواز بوو، بۆیە وای بەباش دەزانم هەر یەك بەجیا لەبارەیانەوە بدوێم.

## أ- یارییەکانی شەوان

شەوگاری ژیانی فەقێیایەتی هەندێ جار درێژ دەبوو، بەناچاری بۆ ئەوەی تەواو بێ پەنایان دەبردە بەر هەندێ یاری بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو جۆرە شەوگارە لەسەرروی هەموویانەوە (کلاوێن)[1] بوو، زۆرجار وادەبوو لاوانی گوندەکەش دەهاتن و دەبوونە لایەنێك لەو یارییە، سەرەڕای ئەم یارییە، هەندێ جار بەچیرۆکی کۆن و حەکایەتی ئەفسانە شەوگاریان دەشکاند.

## ب- یارییەکانی رۆژ

هەندێ یاری هەبوو لەدەرەوە نەبووایە ئەنجام نەدەدراو تام و چێژی خۆی نەدەدا لەوانە:

١- یاری کێڵ و بەردانێ[2].

---

1- کلاوێن- کاڵە مستێن: بەیەکێ لەیارییە فۆلکلۆرییە کۆنەکانی نەتەوەی کورد لەقەڵەم دەدرێ، ئەم گەمەیە لەبەکارهێنانی چەند کلاوێك پێکدێ ژمارەیان تاك بێ (٥، ٧، ٩) تەواوی کلاوەکان ریز دەکرێن و لایەنێك هەنگوستیلەیەك لەژێر یەکێ لەو کلاوانە دەشارێتەوە، لەسەر لایەنی دووەم دۆزینەوەیەتی.

2- (٤) بەرد قوت دەکرایەوە، یەکێ لەپێش سییانەکەی کە لەدوواوە، بەردی هەر لایەك، لەلایەن لایەنەکەی کەوە بەرد باران دەکران تاکو تەواو دەکەوتن، هەر یەکێ بۆی هەبوو سێ بەرد بهاوێ.

٢- یاری تۆپ تۆپانێ[1].
٣- یاری شەقان[2].
٤- یاری هەلوکێن.
٥- یاری سێ بازێنە.
٦- یاری بازدان بەسەر پشتی یەکتر[3].
٧- هەڵپەرکێ و شایی کردن.

ئەم جۆرە یارییانەو چەندین یاری لەم شێوەیە، ڕۆژانی هەینی و سێ شەممان لەکاتی ڕۆژگار خۆشی فەقێیان پەنایان دەبردە بەرو ماوەیەك خۆیان پێوە دەخافلاند زۆرجار خەڵکی ئاوایش لەو یارییانە بەشداری دەکردو دەبوو لایەنێك لەسەنگەکە، هاوکێشەکەی رادەگرت.

# بەزم و هەڵپەڕکێی فەقێیان

بەزۆری فەقێیان، حەزیان لەشایی سێ پێیەو ئایشۆکی دەکرد، بەدەیان بەستەی جۆراو جۆریان لەهەڵپەڕکێی سێ پێییە دەووت، بەزم و رەزمی ئایشۆکیش جیابوو حەوت هەشتێ بەرامبەریان لەیەك دەگرت، بێ دەست گرتن و دەکەوتنە هەنگاونانی رێك و پێك و چەپڵە لێدان و ووتنی گۆرانی (ئایشۆکێ) کەئەمە چەند کۆپلەیەکە لەو بەستەو

گورانیە
ئایشۆکێ وەیشێ وەیشێ
هێدەلا لێم وەیشێ وەیشێ
ئایشۆك گیژە گوێخایە،

---

1- بەپەڕۆ تۆپێکیان دروست دەکردو دەکەوتنە یاری پێکردن کردن.
2- گۆیەکی خریان لەدار دروست دەکردو بەداری گۆپال شێوە لێیاندەدا لەم لا دەبرایە ئەولاو، لەولاوە دەهاتەوە.
3- یەکێ دەچەمایەوەو ئەویتر بەسەر پشتیا بازی دەدا، یەك لەدوای یەك.

خاوەن بەژن و بالآیە
ئایشۆكێ وەیشێ وەیشێ
هێدەلا لێم وەیشێ وەیشێ
بەم شێوەیە، ئەو بەستەیەیان تەواو دەكرد.

# كۆڕی رۆشنبیریو پێشبڕكێ

گومان لەوەدا نیە كە لەناو فەقێیان بەهەزارەها شاعیرو ئەدەب دۆست هەڵكەوتن، هەبوو خۆی توانای هۆنراوەی نەبوو، بەلآم بەسەدان بەیتی شیعری خۆش و پڕ مانای لەبەر بوو، زۆرجار ئەو بەهرەدارانە، بەرامبەریان لەیەك دەگرتو وەكو (المناظره) توانای یەكتریان تاقیدەكردەوە، یان هەندێ هەبوون دەیان مەتەڵی پڕ مانایان لەبەر بوو، وەكو (لغز) بۆ لایەنی دووەمیان دا دەهێنایەوەو، دەبووایە لایەنی دووەمیش تەقەلآی دۆزینەوەی ماناكەی بدات.

أ- لەبارەی شیعرەوە
بێكەس، قەد نەڵێی بێكەس بێكەسە بێكەس[1]
بێكەس تۆی هەیە بێكەس، ئەی تۆ كێت هەیە بێكەس.
ب- لەبارەی پەندەوە
ئەمە چیە چی پێ دەڵێن، پەپكە بەگونجی پێ دەڵێن[2]، عەبای نارنجی پێ دەڵێن.

# گۆزەڵ گۆزی ناو فەقێیان

كاتێ كە فەقێ دەگەیشتە قۆناغی سوختەیی، ناچار دەبوو بەدوای زاناو شوێندا بگەڕێ، كە جێگای سوختەی هەبێ وەكو لەمەوبەر ئامارژەمان بۆ كرد، بەنامەیەكی

---

1- ئەم هۆنراوەیە، شیعری (فائق بێكەسە) و لەگەڵ خوادا مناجات دەكات و دەڵێ (خوایە پێم مەڵێ من بێ كەسم، من تۆم هەیە بەلآم ئەی خوایە تۆ كێت هەیە، كەوابوو من بێكەس نیم تۆ بێكەسی.
2- ئەم پەندەش، بۆ پێناسەی قورئان ووتراوە.

پشتگیری لەماموٚستای پێشووی بوٚ وەرگرتن و خوێندن رووی لەحوجرەیەک دەکرد، تاکو ئەو قوٚناغە لەو حوجرەیە ببڕێ، بەم شێوەیە، هەندێ فەقێ هەبوون دەیان زانا و مەڵبەندو شوێنیان دەکرد تاکو کوٚتاییان بەخوێندن دەهێنا، هاوکات هەبوو، تەواوی کتێبەکانی لەیەک دوو حوجرەو مەدرەسە تەواو دەکرد.

## توٚران و توڕەبوونی فەقێ

هەندێ فەقێ هەبوون جیقڵدانە تەنگ و کەم حەوسەڵە، لەگەڵ مووی لووتی خوٚیان بەشەڕ دەهاتن بە هەر بیانویەک بووایە هەبوو یەک دوو روٚژ موٚڵەتی لەماموٚستاکەی وەردەگرت و دەکەوتە گەڕان بەشوێن جێگایەکی تردا، پاش دوٚزینەوەی شوێنی نوێ، هەندێ جار بێ ماڵ ئاوایی دەڕوٚیشت بێ ئەوەی خواحافیزی لەهاوڕێیەکانی بکات.

## هەندێ لەو دەقانەی لەحوجرە پەیڕەو دەکران

لەحوجرەش، پەیڕەو پڕوٚگرامێکی پوختە هەبوو، دەیان بابەتی یەک لەدوای یەکی لەخوٚ دەگرت، بەدەیان زانیاری جوٚراوجوٚر تاوتوێ دەکرد، لەوانە:

١- شارەزایی لەرووی زانستی (الصرف)

٢- شارەزایی لەرووی زانستی (النحو)

٣- شارەزایی لەرووی زانستی (المنطق)

٤- شارەزایی لەرووی زانستی (معانی)

٥- شارەزایی لەرووی زانستی (بیان)

٦- شارەزایی لەرووی زانستی (بدیع)

٧- شارەزایی لەرووی زانستی (وضع)

٨- شارەزایی لەرووی زانستی (کلام)

٩- شارەزایی لەرووی زانستی آداب البحث

١٠- شارەزایی لەرووی زانستی اصول الفقة

١١- شارەزایی لەرووی زانستی الحكمة والفلسفة

## چوارەم: خوالێخۆشبوو، مامۆستا مەلا رسول یەکەم کوڕی مەلا احمدی یەکەم.

ئەم زاتە لەساڵی (١١٥٤- ١٧٤١) لەشاری هەولێر، لەدایك بوو.

وەکو هەموو نەوەی ئەم بنەماڵەیە، هەرکە تەمەنی گەیشتە (شەش حەوت) ساڵان، دەستی دایە خوێندن، تەواوی کتێبو بابەتەکانی مەلایەتی لەماوەیەکی کەمتر لە هاوڕێیەکانی تەواو کرد.

بە تەواو کردنی بابەتەکانی خوێندنو بڕوانامە وەرگرتن، هەر لەوێ بوو بە مودەریس.

لەسەردەمی ئەو زاتە بوو، کاتێ خوالێخۆشبوو، (مەولانا خالیدی نەقشبەندی)[1] سەردانی شاری هەولێری کردو ماوەیەك بۆ خوێندن لەگوندی گەڕاو لەلای مامۆستا (مەلاعبدالله)ی[2] گەورە مایەوە.

پاش دەیان ساڵ خزمەت کردنی ئاین لەم شارە، لە تەمەنی (٧٢) ساڵی، لەساڵی (١٢٢٨-١٨١٣) کۆچی دوایی کردو، تەرمەکەشی بۆ گوندی گەڕاو بەرێ کراو لەوێ بە خاك سپاردرا.

## پێنجەم:- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا احمدی دووەم کوڕی مامۆستا مەلا رسول یەکەم

ئەم زانایە لە باوشی قەڵای هەولێر، لەساڵی (١١٩٦-١٧٨١) لەدایك بوو، سەرەتای دەست بە خوێندنی لە خزمەتی مامۆستا مەلا رسولی باوکییەوە بوو.

پاش ماوەیەك مانەوە لای باوکی، خۆی گەیاندە خزمەت ئەم زانایانە:

١- مامۆستا مەلا عبدالله کوردی[3].

---

1- ئەم زاتە رابەری گشتی رێبازی نەقشبەندی بوو لە عێراق، لەساڵە (١٧٧٩-١٨٢٦) ژیا.

2- ئەم زاتە باپیرەی گەورەی خوالیخۆشبوو مامۆستا مەلا مجید شەقلاوە (مەلا مجید گەڕاوی) بوو.

3- ئەم زاتە لەساڵانی (١١٦٤-١٢٦٠) بەرامبەر (١٧٥٠-١٨٤٤) ژیا.

٢- مامۆستا مەلا محمد ابن آدم[1].

٣- مامۆستا مەلا صبغة الله بن ابراهيم بن حيدر الثاني، ابراهيم عاصم الحيدري.

پاش تەواو کردنی قۆناغەکانی خوێندنو بڕوانامە وەرگرتن، هەر لە مەدرەسەی (الاحمديه) بووە مامۆستای وانەبێژ، لە فەقێیەکانی ئەو سەردەمەی ئەم مەڵبەندە:

١- مامۆستا مەلا عبدالله مەلا رسول مەلا عمر

٢- مامۆستا مەلا احمد زەلام

٣- مامۆستا مەلا علی ئەفەندی مەلا ابوبکر (کچك مەلا)

٤- مامۆستا مەلا محمد سعيد شێخ هداية الله هەولێری

٥- مامۆستا مەلا ابراهيم فصيح الحيدري.

خوالێخۆشبوو زانای کورد، (ابراهيم فصيح بن صبغة الله حيدري)[2] لە کتێبی (عنوان المجد)دا دەڵێ:

(یەکێ لەو زانایانەی کە بە خزمەتی گەیشتم، مامۆستا مەلا احمدی مەلا رسول گەڕاو بوو، ئەم زاتە عەلامەو شارەزای سەردەمی خۆی بوو، لەناو خەڵکدا بە "الواعظ" ناسرابوو).

لەڕووداوێکی مێژوویی:

ئەم زاتەو مامۆستا مەلا ابوبکر مەلا عثمان (مەلای گچکە)، ڕەوشێکی بالآیان لە هێور کردنەوەو کۆتایی پێهێنانی کێشەی[3] نێوان (میر محمدی ڕەواندزی –

---

1- ئەم زاتە لەساڵی (١١٥٦-١٢٥٢) کۆچی ژیا، بڕوانە ل/١٠٢- علماء ومدارس..

2- ابراهيم فصيح الحيدری لەساڵی (١٨١٩) لەدایك بوو، لەساڵی (١٨٨١) کۆچی دوایی کرد- کتێبی علماء ومدارس ص/٥٦..

3- ئەم بەسەرهاتە لەساڵی (١٢٣٥-١٢٩٩) ڕوویدا.

پاشای کۆرە-)و حاکمی ئەو سەردەمەی شاری هەولێر (یعقوب حاجی قاسم عبدالله)[1] هەبوو.

کەسایەتێکی بە تواناو لێهاتوو بوو، مودەریسی سەردەمی خۆی بوو، لەمانگی (شەعبان) لەسالی (١٢٨١- ١٨٦٤) کۆچی دوایی کردو یەکەم کەس بوو لەم بنەماڵەیە لە گۆڕستانی گەورەی ئەم شارە بەخاك سپاردرا.

## یەعقوب ئاغای شاعیرو پیاو ماقوڵی ئەو سەردەمەی هەولێر

پاش کۆچ کردنی مامۆستا مەلا احمد، زۆر دڵتەنگ بوو، سۆزی هەستاو قەسیدەیێکی لەسەر کۆچکردنی ئەم زاتە وەکو (رثاء) بەزمانی تورکی نووسی، ئەمە چەند دێرێکی ئەو قەسیدەییە بە کوردی.

ئەوەتا

ئەوە ئەحمەد ئەفەندی ناوداره[2]
کە سەروەری دەستەی زانایان بوو

کەس ناتوانی نکولی لەوە بکات کە
دەریای زانستی سەردەمی خۆی بوو

بەم شێوەیە نزیکەی (١٥) کۆپلە شیعری بە زمانی تورکی لەسەر ئەو زاتە نووسی و لەکۆتایی هۆنراوەکەش بەپێی پیتی ئەبجەدی، ئامارژەی بۆ بەرواری کۆچ کردنەکە کرد کە سالی (١٢٨١-١٨٦٤) بوو.

ئەمەش ئەو پارچە هۆنراوەیەی بەزمانی تورکی:

---

1- ئەم زاتە (١٧٨٧-١٨٧٥) ژیا بەرامبەر (١٢٠٤-١٢٩٣).

2- ئەم چەند کۆپلە قەسیدەیە، بەم شێوەیە لەراپۆرتە دەست نووسەکەی مەلا عیرفان مەلا عبدالرحمن مەلا رسول آل الواعیظ نووسرا بوو.

بودور اول احمد افندی بنام[١]

که سەر افراز ایدی بین العلماء

بحر عیلم اولدوغونا عصریندا

کمسه انکار ایلدمەزدی أصلاً

گاه واعظ و گهی تەدریس ایله

گیچوروپ وقت و زمانین حتا

قیلدی بو فانی جهاندان رحلت

ایلەدی دار بقاییی ماوی

سال تاریخ وفاتن ایندی

لفظ واعظله[٢] مدرس ایفا

## شەشەم:- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا رسول دووەم، کوڕی مامۆستا مەلا احمد آل الواعظ

ئـەم زاتـە لەسـاڵی (١٢٣٢-١٨١٦) لەباوەشـی قـەڵا سەرکەشـەکەی هـەولێر لەدایك بوو.

---

1- بۆ یەکەم جار، ئەم هۆنراوەیە لەلایەن د.عبداللە محمد حداد لە دیوانی دەستنووسی غریبی دەرکراوە لە گۆڤارەکان بڵاوی کراوەتەوە.

2- تەواوی ژمارەی پیتەکانی (واعظ) ٩٧٧ ژمارەیەو تەواوی ژارەی پیتی (مدرس) (٣٠٤) ژمارەیەو سەرجەم هەردووکیان یەکسانە بە (١٢٨١) ساڵی کۆچی کردنی مامۆستا مەلا احمدی گەڕاوییە.

لە تەمەنی شەش حەوت ساڵان دەستی دایە خوێندن و لەسەرەتاوە لە مەدرەسەی (الاحمدیة)وە دەستی پێکرد. پاشان چووە خزمەت خوالێخۆشبوو، مامۆستا مەلا ابوبکر هەولێری (مەلای گچکە)و پاشان چووە گوندی گەڕلو لەلای بابیرە گەورەی مامۆستا مەلا عبدالمجید شەقلاوە، ماوەیەك بۆ خوێندن مایەوە.

لەوێیەوە، خۆی گەیاندە لای مامۆستا مەلا عمر ئەفەندی خەیلانی و چەند زانایەك لەزانایانی گوندی (ماوەران). بۆ تەواو کردنی دووا بابەتەکانی خوێندن، گەڕایەوە شاری هەولێرو دووبارە چۆوە لای رەحمەتی باوکی، هەر لەسەردەستی باوکی، خوێندنی تەواو کردو بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرت.

پاش تەواو کردنی خوێندن، ئەویش وەکو زۆربەی زانایانی گەڕاو، لە مەدرەسەی –الاحمدیە– بوو بە مامۆستای تەدریس کردن.

لە فەقێیەکانی:

١– مامۆستا مەلا سلیمان– برازای

٢– مامۆستا مەلا یوسف ئەفەندی

٣– مامۆستا مەلا ابراهیم حاجی طە

٤– مامۆستا مەلا رشید حاجی فتح الله

بەهۆی لێهاتوویی و پەرەسەندنی مەدرەسەی الاحمدیە، لەسەردەمی ئەم زاتە، زۆر کەس بە مەدرەسەی مەلا رسول گەڕاو ناوی دەبرد. یەکێ بوو لە هاوشێوەکانی مامۆستا مەلا عمر ئەفەندی خەیلانی.

لە هاوڕێیەکانی:

١– خوالێخۆشبوو شێخ محمد سعید نەقشبەندی

٢– خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عمر ئەفەندی خەیلانی

٣– خوالێخۆشبوو شێخ علی ئەفەندی حوسامی

٤– خوالێخۆشبوو شێخ ابوبکر هەرشەمی نەقشبەندی

٥– خوالێخۆشبوو شێخ محمد– شێخی چۆلی

٦- خوالێخۆشبوو شێخ ابوبکر دارتاش نەقشبەندی
٧- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا احمد زەلام
٨- خوالێخۆشبوو زانای ناوداری هەولێر، ابراهیم فصیح حیدری.

**مەلا رسول آل الواعیظ**

ماوەیەکی زۆری تەمەنی لەم مەدرەسەیە، بە تەدریسەوە بەسەربرد، دەرسی بەسەدان زانای ئەم شارە داوە. دەیان کەس لەسەردەمی ئەم زاتە بڕوانامەی مەلایەتیان وەرگرت.

لەڕۆژی (عارفە)ی جەژنی ڕەمەزانی سالی (١٣١٢-١٨٩٤)، لە تەمەنی زیاتر لە (٧٥) سالی کۆچی دوایی کرد.

تەرمی ئەم زانایە، بەڕێوڕەسمێکی شیاو، بە ئامادەبوونی جەماوەرێکی زۆری بە ئەمەکی ئەم شارە، لە (گۆڕستانی گەورە)ی[1] شار بەخاك سپاردرا.

## حەوتەم:- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا سلیمان مەلا عبداللە مەلا احمدی دووەم

ئەم زاتە، لەسالی (١٢٨٨-١٨٧٠) لەیەکێ لە گەڕەکەکانی قەلای هەولێر لەدایك بوو، هەر بە مندالی، مامۆستا مەلا عبداللەی باوکی کۆچی دوایی کرد، مامۆستا مەلا رسولی مامی لە ئامێزی گرت، چەند سالێك دەرسی پێبوت.

پاشان لەگەلْ خوالێخۆشبوو شێخ جمیل مەلا عبداللەی جەلی زادە بوون بە فەقێی مامۆستا مەلا علی ئەفەندی حوسامی لە مزگەوتی قەلای هەولێر.

پاشان گەڕایەوە مەدرەسەی -الاحمدیة- لە خزمەت مامۆستا مەلا رسول ئەفەندی، هەموو کتێبەکانی تەواو کردو بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرت.

---

1- ئەم گۆڕستانە، دەکەوتە شوێن ئێستای بازاڕی هەولێری هاوچەرخی نوێ.

مەلا سلیمان دۆستایەتێکی بەبتەوی لەگەڵ ئەم بەڕێزانە هەبوو:

١- شێخ جمیل ئەفەندی

٢- شێخ مەلا رشید فتح الله

٣- مامۆستا مەلا ابراهیم دۆغرەمەچی

٤- شێخ محمدامین شێخ ابوبکر

٥- شێخ یحیی شێخ عبدالرحمن

٦- مامۆستا مەلا صالح مەلا محمد یەگن

٧- مامۆستا مەلا یوسف ئەفەندی[١]

٨- شێخ محمد موفتی مەلا عثمان

ئـەم زاتـە لـە مـانگی رەمـەزانی (١٣٥٦-١٩٣٦) کۆچـی دوایـی کـردو لـە گۆڕستانی گەورەی ئەم شارە بەخاك سپاردرا.

## هەشتەم: خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا سلیم کوری مەلا رسول دووەم

ئـەم زاتـە لەسـاڵی (١٢٩٧-١٨٧٩) لـە گـەڕەکی تۆپخانـەی قـەڵای هـەولێر لەدایکبوو، سەرەتای خوێندنی لای باوکی بوو لە مەدرەسەی الاحمدیە.

پـاش کۆچکردنی بـاوکی، هانـای بـردە بـەر مامۆسـتا مـەلا سـلیمانی بـرای، پاشان بۆ خوێندن ئەم زانایانەی لای خوارەوەی کرد:

١- مامۆستا مەلا شێخ علی ئەفەندی حوسامی

٢- مامۆستا ملا سلیمان برای

٣- مامۆستا مەلا حسن تەرجانی

٤- هەندێ لە زانایانی مەڵبەندی گوندی گەڕاو لەو سەردەمە.

---

1- ئەم زاتە باوکی پارێزەر (عەونی یوسف) بوو.

پاش تەواو کردنی خوێندنو بڕوانامەی وەرگرت لەسەر دەستی مەلا سلیمان برای، لەسەر داواکاری (علی پاشای دۆغرەمەچی) لەساڵی (١٩٢٠) بووە مەلای مزگەوتی گوندی (عەزە- حەزە).

پاش وەفاتی مەلا سلیمان برای، دەگەڕێتەوە سەر مەدرەسەی الاحمدیەو دەبێتە مودەریس.

لەساڵی (١٣٦٨-١٩٤٩) لە تەمەنی (٧٠) ساڵی، کۆچی دوایی دەکاتو ئەویش خاکی گۆڕستانی گەورەی ئەم شارەی دەبێتە نسیبو لەوێ تەسلیم بە خاك دەکرێ.

## نۆیەم:- دوا زانای ئەم بنەماڵەیە، مامۆستا مەلا عبدالرحمن مەلا رسول آل الواعیظ

ئەم زاتە لەساڵی (١٣٠٤-١٨٨٦) زاینی لە هەمان گەڕەك، لە قەڵا لەدایکبوو، بەهەمان شێوەی تێکۆشان خوێندنی تەواو کرد، پاش دەیان ساڵ تەدریس لە مەدرەسەی (الاحمدیة)، لەساڵی ١٩٨٢ کۆچی دوایی کردو خاکی هەمان گۆڕستانی ئەم شارە لە ئامێزی گرت.

لەسەردەمی ئەم زانایە، لەساڵی (١٩٥٥) کاتێ شارەوانی بڕیاری رووخاندنی ئەم مەدرەسەیەی بەدەست هێناو پاش تێکدانی، تەنکێکی ئاوی لەشوێنەکەی قوتکردەوە.

پاش نزیکەی (٢٥٠) ساڵ خزمەتکردن، ئەم مەڵبەندە روخێنراو، رەوشی لێهاتوویی لەم شارە لەکار کردن وەستا. بەم شێوەیە کۆتایی بەرەوشی ئەم بنەماڵەیە، لەشاری هەولێرو لە مەڵبەندی الاحمدیە هات.

ئەوەی شایانی لێدوان بێ، مامۆستا مەلا عبدالرحمن مەلا رسول، کوڕێکی بەناو (مەلا عیرفان) هەیە لەهەولێرو لە گەڕەکی راپەڕین خاوەنی تەکیەو مەقامی تایبەتی خۆیەتی.

لەوانەی لە مەدرەسەی الاحمدیە فەقێ بوونە:

١- مامۆستا مەلا سلیمان مەلا عبدالله دێرەبروشە.

٢- مامۆستا مەلا عبدالمجید عبدالحمید گوێری.

٣- مامۆستا مەلا رسول یونس شاوەیسی.



مەلا عیرفان مەلا عبدالرحمن

٤- مامۆستا مەلا اسماعیل- ناقص.

٥- مامۆستا مەلا عبدالقادر مصطفى ئۆمەر مامك.

٦- مامۆستا مەلا مصطفى حاجی مەلا محمدامین کورتاندور.

٧- مامۆستا مەلا حسین دووگرتکانی.

٨- مامۆستا مەلا احمد جمال مەلا عباس.

٩- مامۆستا مەلا یاسین طه باداوەیی.

١٠- مامۆستا مەلا عمر یاسین مەلا طه.

١١- مامۆستا مەلا صالح مەلا عمر گەڕاوی.

١٢- خەلیفە مەلا زیاد مزگەوتی شێخ چۆلی.

ئەمە بوو کورتەیەك لەمێژووی مەدرەسەو مەڵبەندی الاحمدیە- لەشاری هەولێر.

یەك شەممە

٢٠٠٦/٨/٦

**سەرچاوەكان:**


١- سەردانو دیدەنی مەلا عیرفان مامۆستا مەلا عبدالرحمن مەلا رسول آل الواعظ- لە گەڕەكی ڕاپەڕین لە هەولێر.

٢- دیدەنیو سەردانی جەنابی (د.عبدالله محمد حداد).

٣- كتێبی (العلماء والمدارس في اربیل) نووسینی مامۆستا زبیر بلال اسماعیل.

٤- كتێبی (كورتەیەك لە ژیاننامەی زانا ئایینیەكانی شاری هەولێر) نووسینی (بەندە)و بڵاوكراوەی وەزارەتی ئەوقافو كاروباری ئایینی هەرێمی كوردستان هەولێر (٢٠٠٤).

٥- دەستنووسەكانی بەڕێز/ اسعد مەلا شاكر اربیللی.

# حوجرەو مەدرەسەی
# (مزگەوتی حاجی عبدالقادر دەباغ)



**ئەم مەدرەسەیە:**

بە یەکێ لە مەدرەسە ناودارەکانی سەردەمی خۆی لە قەڵەم دەدرێ، رەوشێکی باڵای لە ئامادەکردن و پێگەیاندنی دەیان زانای ئاینی ئەم وڵاتە هەبووە. سەرەتای دروست کردنی بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە.

هەر بەچەند ساڵێك پاش دروستکردنی مزگەوتەکە، لەسەر داواکاری خوالێخۆشبوو (حاجی عبدالقادر محمد دباغ) دروست کرا.

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا محمدامین بێتواتە کرایە بەرپرس و بەڕێوەبەری ئەم مەڵبەندە. لەسەرەتاوە لەناو مزگەوتی ناوبراو بنیات نرا، هەر پاش کردنەوەی، دەیان فەقێ روییان تێکردو هانایان بۆ هێنا.

مامۆستای رەحمەتی، خۆی و چەند کەسێك لەزانایانی ئەو سەردەمە ئەرکی تەدریسیان لە ئەستۆ گرت.

دەیان زانای ناودارو لێهاتوویان بۆ ئەم نەتەوەیە پێگەیاند، لەوانە:

| | | |
|---|---|---|
| ١- | مامۆستا مەلا احمد عمر احمد | ١٩١٠-١٩٨٧ |
| ٢- | شێخ محمدامین حسن کوردە | ١٨٩٠-١٩٧٤ |
| ٣- | مامۆستا مەلا احمد مصطفى عبدالقادر | ١٩٠٩-١٩٨٩ |

| | | |
|---|---|---|
| ٤- | ماموستا مەلا محمد عبدالكريم محمد | ١٩٢٥-١٩٧٩ |
| ٥- | ماموستا مەلا اسماعيل محمد عبدالله | ١٨٩٥-١٩٣١ |
| ٦- | ماموستا مەلا عبدالله سێبیرانی | ١٩١٣-١٩٩٣ |
| ٧- | ماموستا مەلا سعيد درويش عزيز | ١٩٠٠-١٩٤٧ |
| ٨- | ماموستا مەلا احمد محمد محمدامين | ١٩٠٠-١٩٧٩ |
| ٩- | ماموستا مەلا طاهر ابوبكر مەلا محمود | ١٩٠٣-١٩٨٤ |
| ١٠- | ماموستا مەلا عبدالحميد شەمشوله | ١٩٣٥- |
| ١١- | ماموستا مەلا شێخ مارف جل بەسەرە | ١٩١٠- |
| ١٢- | ماموستا مەلا عبدالمجيد هەرتەلی | |
| ١٣- | ماموستا مەلا مصطفى محمدامين حسين | ١٩١٧-١٩٦١ |
| ١٤- | ماموستا مەلا اسماعيل ماملێ | ١٨٨٩-١٩٥٤ |
| ١٥- | ماموستا مەلا مشير محمدامين | ١٩٢٥-١٩٦٩ |
| ١٦- | ماموستا مەلا صابر كونەگورگی | ١٩٣٠-١٩٨٣ |
| ١٧- | ماموستا مەلا عبدالله محمدامين قادر | ١٩٢٦-١٩٦٧ |
| ١٨- | ماموستا مەلا عبدالرحمن نادر پیربالْ | ١٩٣٢ |
| ١٩- | ماموستا مەلا صديق نۆغەرانی | ١٩٢٢-١٩٩٢ |
| ٢٠- | ماموستا مەلا سيد حسين سيد محی الدين | ١٨٨١-١٩٥٨ |
| ٢١- | ماموستا مەلا اسماعيل ناقص | ١٨٨٥-١٩٥٨ |
| ٢٢- | ماموستا مەلا سليم مەلا سعيد مەلا سليم ئاكرەيی | ١٩٢٦-١٩٩١ |
| ٢٣- | ماموستا مەلا خدر علی احمد | ١٩٠٩-١٩٥٧ |
| ٢٤- | ماموستا مەلا سعيد مەلا محمد مائی | ١٩٢٩-١٩٨٤ |
| ٢٥- | ماموستا مەلا احمد حسين گردعازەبانی | ١٩١٧-١٩٨٤ |
| ٢٦- | ماموستا مەلا عبدالقادر قەڵاتە سۆرانی | |
| ٢٧- | ماموستا مەلا خدر الخورخی المرگی | |

٢٨- ماموستا مەلا عبدالرحمن اللجی- ئێرانی ١٣٦١ کۆچیکرد

٢٩- ماموستا مەلا صابر شێخ مەموندیان ١٣٦٦ کۆچیکرد

٣٠- ماموستا مەلا اسماعیل صالح قەتەوی

٣١- ماموستا مەلا ابوبکر مەلا عثمان شەرەکی

٣٢- ماموستا مەلا صالح جعفر

٣٣- ماموستا مەلا نعمە الله ملا حمدامین باشتەپەیی

٣٤- ماموستا مەلا حسن جمالی- ئێران

٣٥- ماموستا مەلا محمدامین مەلا عثمان دۆڵەمەرزی

٣٦- ماموستا مەلا سلیمان مەلا عمر

٣٧- ماموستا مەلا محمد سعید حسن هەمزەکۆری

٣٨- ماموستا مەلا صالح ئێرانی

٣٩- ماموستا مەلا عبدالرحمن الگوشی باشقالی

٤٠- ماموستا مەلا سعید مەلا ویسی گرتکی

٤١- ماموستا مەلا صالح ئەختەری

٤٢- ماموستا مەلا عبدالله مەلا قادر یاساوەیی

٤٣- ماموستا مەلا ویسی مەلا عبدالله گرتکی

٤٤- ماموستا مەلا خدر ئەفەندی

٤٥- ماموستا مەلا احمد هیرۆیی

٤٦- ماموستا مەلا عبدالرحمن

٤٧- ماموستا مەلا عبدالرحمن (ناقص)

٤٨- ماموستا مەلا شێخ محمود جلبەسەرە

سەرەڕای ئەم زاتانە، دەیان زانای دی، ناو بەناو لەم مەدرەسەیە خوێندویانە.

لەم سەردەمەش لایەك لە مزگەوتەکە کراوەتە مەدرەسەی ئایینی و بە دەیان قوتابی تیایدا دەخوێنن.

لەو زانایانەی لەم مەدرەسەیە تەدریسیان کردووە:

١- ماموستا مەلا محمدامین کونەفلوسە- خۆی

٢- ماموستا مەلا عبدالله مەلا محمدامین- کوڕی

٣- ماموستا مەلا فائز مەلا عبدالله- کوڕەزای

٤- ماموستا مەلا علی مەلا عبدالله- کوڕەزای

٥- ماموستا مەلا خالد مەلا فائز- نەوەی

٦- ماموستا مەلا عماد مەلا فائز- نەوەی

سەرەڕای ئەم زاتانە، دەیان زانای ئەم شارە چ ئێستاکە چ لە کۆن ڕەوشی بالاّیان لە تەدریس هەبووە، یان هەیە.

ئەمە چەند دێرێك بوو لەمێژووی ئەم مەدرەسەیە.

٢٠٠٦/٥/٥

سەرچاوەکان:

١- سەردانی ماموستا مەلا خالد مەلا فائز.

٢- کتێبی (علماء ومدارس في اربيل) زبير بلال اسماعيل.

٣- راپۆرتە دەستنووسەکەی ماموستا مەلا خالد مەلا فائز.

٤- کتێبی گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی شاری هەولێر، دانانی (بەندە)و بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف، هەولێر ٢٠٠١.

٥- کتێبی (کورتەیەك لە ژیاننامەی زانا ئاینییە کۆچ کردووەکانی هەولێر، نووسینی (بەندە) بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف، هەولێر ٢٠٠٤.

# حوجرەی مزگەوتی ( ئەسعەد ئەفەندی )[1]

ئەم حوجرەیە لەناو مزگەوتی ئەسعەد ئەفەندی بوو لە قەلاّی هەولێر.

لە هەندیّ سەرچاوە بە (مزگەوتی –الكف– ناو لەپ) ناوبراوە، بەپێی قسەی ماموّستا عبدالقادر رسول بەحرکەیی تاکو سالانی شەستەکانیش مابوو.

لەسالّی (١٩٦١) لەلایەن خوالیّخۆشبوو (عبدالوهاب ئاغا)وە نوژەندکرایەوە، بەداخەوە لەسەرەتای سالانی حەفتاکانەوە، مزگەوتو حوجرە فەراموّش کراو لەلایەن شارەوانییەوە لایّکی روخیّندرا، ئەوەی مابوو، روّژ لەدوای روّژ بەرەو کەلاوەیی دەچوو، لە مانگی (مایس/ ٢٠٠٦) خوّم سەرکەوتمە سەر قەلاّو بەنیازی بینینی پاشماوەکەی، سەردانیم کرد. تەنها چەند لایەنێکی بچوكو کەلاوە شێوەی مابوو، خانەوادەیەك وەکو پەناگا هانایان برد بوّ بەری‌و لەناوی حەوابوونەوە.

بەداخەوە لەو چەند دێرەی کە ماموّستا زبیر بلال لە کتێبەکەیدا ئامارژەی بوّ دەکات، زانیاری زوّرترمان بەدەست نەکەوت.

1– بروانە لاپەرە (٢١، ٢٢) لە کتێبی (علماء ومدارس في اربيل)– ماموّستا زبیر بلال اسماعیل– ١٩٨٤.

# حوجرەی مامۆستا مەلا ابراهیم دۆغرەمەچی[١]



ئەم حوجرەیە لە مزگەوتێکی بچوکی سەر قەڵا بوو، تاکو ئەم سەردەمەش ئەو مزگەوتە ماوەو بە (مزگەوتی شێخان- ابراهیم دۆغرەمەچی) ناو دەبرێ.

مامۆستای خوالێخۆشبوو مەلا ابراهیم، یەکەم مودەریسی سەردەمی خۆی بوو لەو مزگەوتە. دەیان زانای ئایینی ئەم شارە، لەوێ فەقێیاتیان کردووە.

1- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# حوجرەی مزگەوت و خانەقای
# شێخ أبوبکر هەرشەمی نەقشبەندی



ئەم حوجرەیە، هەر لەناو مزگەوتی ناوبراو بوو، بەشێوەیەکی گشتی، زانایانی هەرشەم و نەقشبەندیەکان سەرپەرشتیان دەکرد.
بەدەیان زانای ئەم شارە، بەتایبەت موریدانی ڕێبازی نەقشبەندی، لەم مەدرەسەیە خوێندویانە، ماوەیەکی زۆر خوالێخۆشبوو شێخ ابوبکر نەقشبەندی خۆی سەرپەرشتی کردو پاش ئەویش خوالێخۆشبوو شێخ مصطفی-ی کوڕی.
دەیان زانای ئەم دەڤەرە، هەڵگری بڕوانامەی ئەم زاتەن.

بۆ بەڵگە، ئەو بڕوانامەیەی کە وەکو بەڵگەنامە لەم بابەتە هاوپێچە، نمونەیەکە لەو بڕوانامانەی کە خوالێخۆشبوو (شێخ مصطفی نەقشبەندی) داوێتە فەقێیەکانی پاش تەواو کردنی خوێندن.

بەهۆی نەبوونی سەرچاوەوە، توانای لەمە زۆر تر نووسینمان نەبوو لەسەر ئەم حوجرەیە.

**سەرچاوە:**

١- کتێبی (علماء ومدارس في اربيل)- زبير بلال ١٩٨٤.

٢- کتێبی گەشتێك بەناو مزگەوتو تەکیەکانی شاری هەولێر، دانانی (بەندە)و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف، هەولێر ٢٠٠١.

# حوجرەی مزگەوتی شێخی چۆلی




لەم مزگەوتەش، حوجرەیەك هەبوو بۆ فەقێ راگرتنو فێر کردنی، دەیان زانای ئەم شارە بەتایبەتی موریدانی جەنابی شێخی چۆلی، لەم حوجرەیە بوون بە فەقێو چەندین قۆناغیان تیا تەواو کرد.

تاکو ئەمڕۆش زانای ئاینی لە دەرچووانی ئەو حوجرەیە ماوە.

## حوجرەی مزگەوتی خانەقای گەورەی ناو بازاڕ [1]



ئـەم حوجرەیـەش کاتی خۆی لەناو ئەو مزگەوتـە بـوو، لەسـەردەمێك گرمـەی دەهاتو دەیـان فەقێ تیایـدا دەهـاتن‌و دەچوون.

لـەو سـەردەمەوەی کـە خوالێخۆشـبوو (مـەولانا خالـد نەقـشبەندی) سـەردانی کـرد، نـاوی خانەقای گرتە خۆ.

لە زانا ناودارەکانی ئـەم مەدرەسـەیە، خوالێخۆشبوو (هدایه الله هـەولێر) (مـەلا شـریف دووشیوانی)یە.

ئەم زاتە یەکێ بوو لە خەلیفەکانی مەولانا خالد لەشاری هەولێر.

1- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# حوجرەی زانایانی حەیدەریەکان

هەموو بنەماڵەی حەیدەریەکان دەناسین، سەدان ساڵە خزمەتی ئەم ئاینە پیرۆزە دەکەن، سەرەڕای حوجرەی گوندی (ماوەران).

لەهەولێریش، لەنزیك مزگەوتی شێخ اللە، لەناو جەرگەی شار، حوجرەیەکیان دامەزراندو، دەیان مودەریسیان بۆ تەرخان کردو، دەیان زانای ئەم شارە لەو حوجرەیە فەقێ بوونە.

ئەم حوجرەیە، بە (حوجرەی حەیدریەکان) ناسرابوو.

بەداخەوە ، لەمە زیاتر زانیاریم دەربارەی دەست نەکەوت تاکو سەرلەنوێ بۆ مێژوو بینوسمەوە.



## حوجرەی مزگەوتی حاجی داود

مزگەوتی مەلا داود (مزگەوتی گەورەی ناو بازاڕ)یش لەمزگەوتەکانی تری ئەم شارە کەمتر نەبووە، لەسەردەمێك، مەڵبەندی خوێندنی ئایینی بووە، دەیان زانای ناوداری کورد لەم حوجرەیە تەدریسیان کردووە، ژمارەیەکی زۆری مەلاکانی ئەم شارە، لەم حوجرەیە فەقێ بوونە.

خوالێخۆشبوو مەلا عمری کەوری سەردەمێك بەڕێوەبەری مەدرەسەی ناو ئەم مزگەوتە بوو.

تاکە مزگەوتو حوجرە بووە، کە بایەخی تەواوی بە فێرکردنی نابینایەکان داوە، زۆربەی حافیزی ئەم شارە، لەم حوجرەیە جێگاو رێگاو بەشە دەرسی خۆی هەبوو.

لەسەردەمێك دەیان گرووپی نابینایان لەم حوجرەیە کۆبوونەوەو زۆربەیان دەیان سورەتیان لە قورئانی پیرۆز لەبەر کردو بوو وەکو (قارئ القرآن).

## حوجرەی مزگەوتی شێخ نورالدین




مزگەوتی شێخ نورالدین لەگەڕەکی تەعجیل لە نزیك گەرماوی (١١)ی ئادارە، لەم مزگەوتە حوجرەیەك هەبوو، لەسالانی نێوەی یەکەمی سەدەی بیستەمی زاینی، دەیان زانای ئەم شارە لەو حوجرەیە خوێندویانە.

لەزانا ناودارو مودەریسە لێهاتووەکانی ئەم حوجرەیە، خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا صالح کۆزەپانکە. دەیان زانای دی

مامۆستا مەلا صالح زانایێکی کەم وێنە بوو، مودەریسێکی بە توانابوو، هەڵگری بڕوانامەی مەلا فەندی هەولێر بوو.

# حوجرەی مزگەوتی

# موفتی



ئەم حوجرەیە، لەناو مزگەوتی موفتی بوو، لە گەڕەکی تەعجیل، چەندین زانای ئەم شارە لەوێ فەقێیایەتی کردووە، لە زاناو مودەریسەکانی:

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا اسحاق، پاش ئەم زاتەش مامۆستا مەلا عبدالرحمن موفتی کوڕی، لەم حوجرەیەش، دەیان زانای ئەو سەردەمە چەند قۆناغێکی خوێندنیان تیا بڕیو بوون بە مەلا...

# حوجرەی مزگەوتی

# دێربروشە



ئەم حوجرەیەش، سەر بە مزگەوتی ناوبراو بوو لەگەڕەکی عارەبان لەناوەندی شار.

دەیان ساڵ فەقێی هەبوو، دەیان زانای ئەم شارە لەم حوجرەیەدا خوێندویانە.

لە ماماۆستاکانی ئەم حوجرەیە:

١- خوالێخۆشبوو مامۆ ستا مەلا محمد دێرەبروشە.

٢- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبداللە مەلا محمد دێرەبروشە.

٣- مامۆستا مەلا سلیمان مەلا عبداللەی دێرەبروشە.

بەداخەوە، وا بۆ نزیکەی (٥٠) ساڵ دەچێ، رەوشی حوجرەو خوێندنی فەقێ لەم شارە لەکورتیدایە.

# حوجرەی مزگەوتی سەید محمود لە گەڕەکی عارەبان




ئەم مزگەوتەش، حوجرەی تایبەتی خۆی هەبوو، زۆر جار بە حوجرەی مزگەوتی پاشا ناودەبرا. بەهەمان شێوە، دەیان زانای ئەم شارە، لەم حوجرەیە فەقێیایەتی کردووە. لە مامۆستاکانی لە سالآنی شەستەکان، (مەلا ابوبکر عبدالله احمد هورمزیار) کە لەوێ و لە مەدرەسەی مزگەوتی ناو بازاڕ (مەلا داود) تەدریسی دەکرد.

((کۆمەڵەی دووەم))

# حوجرەی مزگەوتی
# شێخ عمری بالیسان[1]




ئەم حوجرەو مەدرەسەیە سەر بە مزگەوتی ناوبراو بوو لەگەڕەکی سێتاقان لەناوەندی شاری هەولێر.

سەرەتای دامەزراندنی بۆ ساڵی (١١١١)ی کۆچی دەگەڕێتەوە، بۆ لێدوان لەرەوشی پێویستە ئاوڕیەك لە مێژووی شێخانی بالیسان بدەینەوەو چەند دێڕیەکیان لەبارەوە بنووسین.

کاتی خۆی، باپیرە گەورەی ئەم بنەماڵەیە، خوالێخۆشبوو (شێخ عیسی شێخ احمد)[2] کە یەکێ بوو لە زانا کەم وێنەکانی سەردەمی خۆی، حوجرەو مەدرەسەیەکی پڕ فەقێی لە گوندی بالیسان هەبوو.

---

1- بۆ زیاتر شارەزا بوون، بڕوانە لاپەرە (٧٧) لە کتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکان) نووسینی (بەندە)و بڵاوکراوەی ئەوقاف ٢٠٠١.

2- ئەم زاتە سەرەڕای تەدریس، هەندێ کتێبی لەبوارەکانی خوێندنی ئاینی داناوە، یەکێ لەو کتێبانە لە مەدرەسەی بەحرکەیە ناوی (عیسی بن احمد)ی لەسەر نووسراوە.

لەو سەردەمەوە، ئەم بنەماڵەیە، پشت لەدوایی پشت بە تەدریسەوە هاتوون، سەدان زانای کوردستان فەقێی مەدرەسەی ئەوان بوونە، بەدەیان فەقێ لە هەر چوار پارچەکەی کوردستانەوە هانایان بردۆتە بەر مەدرەسەی ئەوان.

بەدەیان زانا ناودارەکانی کورد، هەر بۆ (تبرك) سەردانی ئەم مەدرەسەیەیان کردووەو چەند کتێبێکیان لێ خوێندووە، لەوانە:

(حەزرەتی شێخ مەولانا خالد نەقشبەندی شارەزووری)

ئەم زاتە لەقۆناغی موستەعیدی چەند کتێبێکی لەم مەدرەسەیە خوێندووە. مەدرەسەی بالیسان‌و زانایانی، ماوەیەکی زۆر سەرچاوەی زانستیە شەرعیەکان بوون لەکوردستان بەگشتی‌و لەم دەڤەرە بەتایبەتی، بەتایبەت لەسەردەمی خوالێخۆشبوو (مەلا شێخ طەی شێخ علی بالیسانی).

سەرەڕای جەنابی مەولانا خالد، ئەم زانانەش لەم مەدرەسەیە خوێندویانە:-

١- خوالێخۆشبوو جەنابی شێخ مطصفی نەقشبەندی.
٢- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا صادق ماویلی.
٣- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبداللەی سکتانی.
٤- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا ابوبکر کۆیی- دووگرتکان.
٥- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا سەید محمدی مەلەکان.
٦- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عمری تەرجانی- مەلا عمری کەوور.
٧- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا قادری گۆپتەپە.

پاش وەفاتی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا شێخ طەی شێخ علی بالیسانی لەساڵی (١٩٢٨)، خوالێخۆشبوو شێخ عمری کوڕی تەواوی ئەرکی مەدرەسەکەی لە ئەستۆ گرت لەسەرەتای ساڵانی پەنجاکان، شێخ عمری بالیسانی، بڕیاری گواستنەوەی مەدرەسەکەی بۆ ناو شاری هەولێردا. ئەوەبوو لەگەڕەکی سێتاقان، لەناوەندی ئەم شارە، هەستا بەدامەزراندنی مزگەوتێك بەناوی (مزگەوتی شێخ عمر بالیسانی) بەتەواو بوونی، بەشێکی لێدابڕیو

کردیه مەدرەسەی ئایینی و راستەوخۆ سەرپەرشتی کردو تەواوی ئەرکەکانی لەئەستۆ گرت لەهەمان رەوشی مزگەوت و حوجرەی کۆنی بالیسان، بەدەیان زانای ئایینی هانایان بردە بەرو بوون بەفەقێ لەوێ لەوانە:

ا- سوختەکان

١- مەلا کمال گوندی گۆپال

٢- مەلا اسماعیل بلباس

٣- مەلا عبدالله بلباس

٤- مەلا فەقێ ابراهیم

٥- مەلا عبدالله حاجی رشید

ناوی ئەو زانایانەی لەکۆتایی سالآنی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکان لەو مەدرەسەیە فەقێ بوون

١- مامۆستا مەلا خدر مەلەکی

٢- مامۆستا مەلا خدر خەلیفان

٣- مامۆستا مەلا عبدالله ماونان

٤- مامۆستا مەلا احمد نالوسی- خاوەن قۆناغ و پیاو ماقول لەشارۆچکەی (شنۆ)

٥- مامۆستا مەلا مصطفی مەلا حسن بلباس

٦- مامۆستا مەلا محمد قادر قەلآچۆغان

٧- مامۆستا مەلا حمدامین دەربەندی (حمدالله)

لەسوختەکانی سالآنی پەنجاکان لەم مەدرەسەیە

١- مەلا مجید مامەرۆکی

٢- مەلا عمر قەرانچۆغانی

٣- مەلا عبدالله کەرکوکی

٤- مەلا یوسف هەرکی

٥- صالح سەرکەندی

٦- صالح فریزی
٧- مەلا عبدالله شاویسی
٨- مەلا نوری دووسەرەیی
٩- مەلا سەید صابر
١٠- مەلا سەید بهاءالدین
١١- مەلا عبدالرحمن حاجی عبدالله
لەموستەعیدەکان لەهەمان سەردەم
١- خوالێخۆشبوو ماموٚستا مەلا عبدالرحن شەمشوله
٢- خوالێخۆشبوو ماموٚستا مەلا عبدالکریم مەلا خورشید جانەیی
٣- مەلا محمد گرتکی
٤- مەلا عثمان عاللایی
٥- مەلا عبدالله کەندارەقەل
٦- مەلا جعفر هێلەوەیی
لەوانەی کە لەم مەدرەسەیە، خوێندنیان تەواوکردو هەر لەوێش بڕوانامەی مەلایەتیان وەگرتووە.
١- ماموٚستا مەلا عبدالرحمن وەرتێ
٢- ماموٚستا مەلا جعفر هێلەوەیی
٣- ماموٚستا مەلا علی حمد خەرابەدراوەیی
٤- ماموٚستا مەلا مصطفی مەلا احمد (قەڵەم زەرد)
٥- ماموٚستا مەلا شێخ محمد بالیسانی- برای شێخ عمر بالیسان
٦- ماموٚستا مەلا عمری گردەشێری
٧- ماموٚستا مەلا سعید نوواوی
٨- ماموٚستا مەلا انور شەمشوله
پاش چەند ساڵێك، ئەم مەدرەسەیە، بەبڕیارێکی حوکومەتی ئەو سەردەمە کرایە (ملحق)ی مەدرەسە ئاینییە حوکومیەکان، لەشێوەی قوتابخانەی (فورمی)

چەند پۆلێکی تیا دروست کراو فەقێیەکان لەشێوەی قوتابی ڕۆژانە دەهاتنە خوێندن و بەشە دەرسی خۆیان وەردەگرت.

لەساڵی (١٩٧٤) بەهۆی ئاڵۆزی بارودۆخی ئەو سەردەمەی کوردستان لەم مەدرەسەیەش وەکو سەدان حوجرەو مەدرەسە، خوێندن ڕاگیراو تەواوی مامۆستاو فەقێیەکان پەراگەندە بوون. پاش دەیان ساڵ داخستن، لەساڵی (١٩٩٧) بۆ جاری دووەم دەرگای حوجرەی ئەم بنەماڵە کرایەوەو، ئەمجارەیان نزیکەی (٥) دانە ساڵ بەردەوامبوو. لەساڵی (٢٠٠٢) سەر لەنوێ داخرایەوە.

لەمامۆستاکانی ئەم مەدرەسەیە

١- خوالێخۆشبوو شێخ طه شێخ علی بالیسانی

٢- خوالێخۆشبوو شێخ عمر شێخ علی بالیسانی

٣- خوالێخۆشبوو شێخ محمد علی بالیسانی

٤- خوالێخۆشبوو شێخ ابو بکری برای علی بالیسانی

٥- مامۆستا مەلا ابراهیم بێلاوە

٦- مامۆستا مەلا عبدالباسط بابەشێخ شێخ عمر بالیسانی

ئەمە بوو چەند زانیاریەك دەربارەی ئەم مەدرەسەیە.

٢٠٠٦/١١/٢٥

سەرچاوەکان:

١- سەردانی جەنابی کاك شێخ عبدالباسط بالیسانی.

٢- کتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی ناو شاری هەولێر، نووسینی (بەندە) و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقافی هەرێمی کوردستان، هەولێر (٢٠٠١).

٣- کتێبی کورتەیەك لەژیاننامەی زانا ئایینیە کۆچکردووەکان هەولێر، نووسینی (بەندە) و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف (هەولێر ٢٠٠٤).

٤- ڕاپۆرتە دەست نووسەکەی جەنابی کاك شێخ عبدالباسط باباشێخ بالیسانی.

# حوجرەی مزگەوتی

# حاجی مراد



ئەم حوجرەیە سەر بەمزگەوتی ناوبراو بوو، لەگەڕەکی سێتاقان، ناوەندی شاری هەولێر. سەرەتای دامەزراندنی، بۆ سەرەتای دامەزراندنی مزگەوتەکە دەگەڕێتەوە، ساڵی ١٩٦١ لەیەکەم ڕۆژەوە، جەنابی مامۆستا مەلا شێخ عبداللە شێخ محمدامین زیخان، تەواوی ئەرکی بەڕێوەبردنی لەئەستۆ گرت. لەماوەی ئەو چەند ساڵەی رابوردو، بەسەدان فەقێ لەم حوجرەیە خوێندنیان تەواوکرد لەسەردەمێك وەکو قوتابخانەیەکی لێهات و چەند پۆلێکی لەخۆی گرت.

تاکە حوجرە بوو لەم شارە، بەشی خوێندنی ئافرەتانی جیاواز بوو، بەسەدان ئافرەت لەو حوجرەیە فێری خوێندنی بابەتە ئایینیەکان بوون، تەواوی دەرسەکانی قورئان و فەرموودەکانی خواو پێغەمبەری خوایان خوێند. تاکو ساڵی (٢٠٠٦)یش بەردەوام بوو.

مامۆستا مەلا شێخ عبدالله، لەگەڵ ئەوەی پێشوازیەکی شیاوی لێکردین، بەڵام سەبارەت بەرەوشی حوجرەکە، هیچی لەبارەوە بۆ نەدرکاندین.

پێنج شەممە
٢٠٠٦/١١/٣٠

سەرچاوەکان:


١- سەردانی مەدرەسەکە لەنزیکەوە.
٢- سەردانی مامۆستا مەلا شێخ عبداللەی زیخان- بەداخەوە بەدەنگ داواکارییەکەمانەوە نەهات و هیچی بۆ نەدرکاندین..
٣- کتێبی (علماء ومدارس في اربیل) مامۆستا زبێر بلان اسماعیل- ١٩٨٤.
٤- کتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی شاری هەولێر) نووسینی (بەندە) و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی لەهەولێر (٢٠٠١).

# حوجرەی (المحمدية)[1]



فەقێیەکانی حوجرەی مزگەوت (المحمدية)

ئەم حوجرەیە سەر بەمزگەوتی (المحمدية)یە لەگەڕەکی ئیسکان لەشاری هەولێر. بۆ لێدوان لەمێژووی ئەم حوجرەیە، پێویستە بابەتەکەمان دوو قۆناغ لەخۆ بگرێ. یەکەمیان سەرەتای دامەزراندنی، دووەمیان گواستنەوەی حوجرەی (ابن خلكان للعلوم الدينية) بۆ ئەم مزگەوتە.

---

1- بۆ زیاتر شارەزابوون لەمێژووی ئەم مزگەوتە، بڕوانە لاپەڕە (١٠٩) لەکتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی شاری هەولێر) لەنووسینی (بەندە)و بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف لەهەرێمی کوردستان (٢٠٠١).

## یەکەم:

سەرەتای دامەزراندنی حوجرە لەم مزگەوتە، بۆ ساڵی (١٩٦٢) دەگەڕێتەوە. کاتێ خۆی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا (طاهر ابوبکر)[1] سوسەیی لەو مزگەوتە (ئیمام و وتارخوێن و مودەریس) بوو، زیاتر لە (٢٠) دانە ساڵ دەرس وتنەوەو پێگەیاندنی دەیان زانای ئاینی لەم حوجرەیە بەردەوامبوو، بەهۆی کۆچ کردنی مامۆستا مەلا طاهر سوسەیی لە (١٩٨٤/٤/٥) خوێندن ئەم حوجرەیە وەستاو، فەقێیەکان هەر یەیك بەلایەکدا پەراگەندە بوون و دەرگای حوجرەکە داخرا.

## قۆناغی دووەم:

لەسەرەتای ساڵی (١٩٩٢) حوجرەی (ابن خلکان للعلوم الدینیة) کە لەوە پێش مامۆستا مەلا (سەید احمد سەید عبدالوهاب بەرزنجی) لەمزگەوتی مامۆستا مەلا عبداللەی فەرهادی لەگەڕەکی زانیاری دامەزراند بوو، گواستیانەوە بۆ ئەم مزگەوتەو سەر لەنوێ مزگەوتەکە بەدەنگی خوێندنی فەقێ بۆ جاری دووەم ئاوەدان کرایەوە.

ماوەی (٦) دانە ساڵ، هەر بەو ناوە مایەوە، لەساڵی (١٩٩٨) ناوەکەیان گۆڕی بە (المحمدیة) و لەو کاتەوە تاکو ئەمڕۆ کەبۆ نزیکەی (١٠) ساڵ دەچێ هەر لەژێر ئەو ناوە ڕەوشی لێهاتووی خۆی دەبینێ.

بەهەوڵ و تەقەلای (حاجی جاسم حاجی محمد توتنچی و مامۆستا مەلا سەید احمد) چەندین ژوور بۆ خوێندن کرایەوەو بەدەیان فەقێی لەخۆگرت.

---

1- بۆ زیاتر شارەزابوون لەژیاننامەی ئەم زاتە، بڕوانە لاپەڕە ١٣٦ لەکتێبی (ژیاننامەی زانا ئایینیە کۆچکردووەکان) نووسین بەندەو بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف لەهەرێمی کوردستان (٢٠٠٤).

بەدەیان منداڵی نەتەوەی کورد بۆ فێربوون و خوێندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی ڕێگای ئەم حوجرەیان گرت و خۆیان تیا ناو نووس کرد.

لەم حوجرەیە، هەردو قۆناغی سوختەیی و موستەعیدی تیادایەوە رۆژانە بەشە دەرسی خۆیان هەیە،

## لەمامۆستاکانیان:

١- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا طاهر ابوبکر سوسەیی.

٢- مامۆستا مەلا (بهاءالدین احمد عبدالله) ئیمام و خەتیبی ئێستای مزگەوتی سەید غریب لەگەڕەکی سێتاقان.

٣- مامۆستا مەلا سەید احمد سەید عبدالوهاب بەرزنجی.

٤- مامۆستا مەلا محمد صادق ویسی گرتکی.

٥- مامۆستا مەلا محمد (ئینە).

٦- مامۆستا (مەلا مغدید کەریم) وتار خوێنی ئێستای مزگەوتی (حاجی بکر زێرنگر) لەگەڕەکی ئیسکان.

٧- مامۆستا (مەلا لقمان علی) وتار خوێنی مزگەوت و تەکیەی بەرزنجی لەگەڕەکی رزگاری.

٨- مامۆستا (مەلا نوزاد فتاح احمد)، وتار خوێنی ئێستای مزگەوتی (الرفاعی) لەگەڕەکی نیشتمان.

٩- مامۆستا (بلال علی) وتار خوێنی ئێستای مزگەوتی شەهید محمد شێخە لەگەڕەکی (٩٢).

١٠- مامۆستا مەلا (علی مەمك) رانیەیی، ئیمامی مزگەوتی المحمدیە (حاجی قەرۆك).

١١- مامۆستا مەلا مختار حبیب زەلمی.

١٢- مامۆستا مەلا سامی عبدالخالق.

سەرەڕای وانە سەرەکییەکان، لەم حوجرەیە خوێندنی ئەم دەرسانەش پەیڕەو دەکرێن و بەبابەتی گرنگ لەقەڵەم دەدرێن:

١- هونەری دارشتن و نووسین (فن الاملاء والانشاء).

٢- شارەزایی پەیداکردن لەناسینی خواوەند (علم معرفة الاله) (معرفه الله).

٣- فێربوونی خوێندنەوەی وتاری هەینی (علم الخطابة).

پاش کۆتایی پێهێنان بەخوێندنی کتێبەکان، فەقێیەکە بەنامەیەکی پشتگیریەوە رەوانەی لای زانایەکی ناوداری دەڤەرەکە (شارەکە) دەکرێ و لەوی بڕوانامەی پێ خەڵات دەکرێ.

## ناوی هەندێ لەدەرچووانی ئەم حوجرەیە:

١- مامۆستا مەلا لزگین علی طاهر

٢- مامۆستا مەلا فیض الله خلیل حمزه

٣- مامۆستا مەلا محمد بابکر محمد

٤- مامۆستا مەلا عونی حمه حسن

٥- مامۆستا مەلا هیوا اسماعیل محمد

٦- مامۆستا مەلا ئاکۆ مجید محمد

٧- مامۆستا مەلا شکیب ابراهیم طه

٨- مامۆستا مەلا احمد مصطفی علی

٩- مامۆستا مەلا غیاث عبدالله اسماعیل

١٠- مامۆستا مەلا صدقی محمد امین عیسی

١١- مامۆستا مەلا علی صادق اسماعیل

١٢- مامۆستا مەلا عبدالمجید سلیمان حسن

١٣- مامۆستا مەلا مولود خضر محمد

١٤- مامۆستا مەلا وزیر باپیر رسول

١٥- مامۆستا مەلا عصام الدین علی عبدالله

١٦- ماموّستا مەلا نوزاد ابوبكر رسول

١٧- ماموّستا مەلا حسين خليل عبدالله

١٨- ماموّستا مەلا هوشيار اسماعيل مصطفى

سەرەڕای ئەم زانانە، بەدەیان فەقێی دی لەم حوجرەیە خوێندویانە، بەڵام بەداخەوە ناوەکانیانمان بەدەست نەکەوت، تاکو ناو نووسیان بکەین.

## لەفەقێیەکانی ئێستای حوجرە، ئەمانە

١- مەلا امين محمد علي

٢- مەلا ابراهيم عثمان حسين

٣- مەلا بروا سلام ابراهيم

٤- مەلا سردار جمال عبدالله

٥- مەلا سداد انور ياس حسين

٦- مەلا رعد نوری توفيق

٧- مەلا شمال اسماعيل كريم

٨- مەلا طاهر محمدامين عبدالرحمن

٩- مەلا فاروق احمد سليمان

١٠- مەلا لقمان صمد خضر عبدالرحمن

١١- مەلا محمد شيخ محمد حسين

١٢- مەلا محمد حمادی علی محمد

١٣- مەلا علی احمد سليمان محمد

١٤- مەلا عبدالقادر رسول قادر عبدالله

١٥- مەلا عدنان نبی حسين

١٦- مەلا نجم الدين عبدالله رمضان

١٧- مەلا نظمی عمر بايز قادر

١٨- مەلا نجم رشيد محمد

١٩- مەلا مطلب جلال محمد

## کاروباری حوجره:

کاروباری حوجرەو فەقێیەکان، لەئەستۆی حاجی جاسم حاجی محمد توتنچی و مامۆستا مەلا سەید احمد سەید عبدالوهاب بەرزنجیە، مام حاجی، هەرچی پێداویستی خۆراك و رایەخ و پێخەف هەیە لەئەستۆی گرتووە، مامۆستاش تەواوی لایەنی خوێندن و مامۆستاو سەرچاوە، لەوان بترازێ مامۆستا مەلا (علی مەمك)ە، خۆی بەخزمەت کردنی حوجرەکەوە تەواو ماندوکردووەو ئەرکەکانی لەئەستۆ گرتووە بەشێوەیەکی گشتی، ئەم حوجرەیە، یەکێکە لەحوجرە ناودارەکانی ئەم شارەو رەوشێکی بالآی لەپێگەیاندنی زانایان هەیە.

٢٠٠٦/١٢/٣٠

سەرچاوەکان:

١- سەردانی حوجرەکە لەنزیکەوەو گفتوگۆ لەگەڵ فەقێیەکان.
٢- سەردانی مام حاجی جاسم حاجی محمد توتنچی لەماڵەوە لەگەڵ مامۆستا نەوزاد.
٣- سەردانی مامۆستا مەلا سەید احمد سەید عبدالوهاب بەرزنجی.
٤- کتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی شاری هەولێر) نووسینی (بەندە)و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف- ٢٠٠١.
٥- کتێبی (کورتەیەك لەژیاننامەی زانا ئایینیە کۆچکردووەکان) نووسینی (بەندە)و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف- ٢٠٠٤.

# حوجرەی مەدرەسەی ( ئیمام مالك )[1]



وێنەی چەند فەقێیەك لە فەقێیانی ئێستای حوجرەكە

ئەم حوجرەیە، سەر بەمزگەوتی (سەید غریب سەید فرج)ە[2] لەگەڕەكی سێتاقان لەناوەندی شار. سەرەتای دامەزراندنی بۆ ساڵی (١٩٦٧) دەگەڕێتەوە كاتێ جەنابی مامۆستا مەلا (بهاءالدین شێخ احمد عبدالله)[3] هاتە ئەم شارەو

1- ناوی دانەری (مەزهەبی مالكی)یە.

2- بۆ زیاتر شارەزابوون، بڕوانە لاپەڕە (٨٤) لەكتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەكیەكان) نووسینی (بەندە) و بلاْوكراوەی وەزارەتی ئەوقاف لەهەرێمی كوردستان- هەولێر ٢٠٠١.

3- ئەم زاتە لەساڵی (١٩٢٩) لەگوندی (خەتێ) لەدایك بووەو هەڵگری بڕوانامەی مامۆستا مەلا صالح كۆزەپانكەیە لەساڵی ١٩٥٣، لەساڵی (١٩٦٧)وە لەم مزگەوتە ئیمام و خەتیب و مودەرەسە.

لەم مزگەوتە جێ گیربوو[1] خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا علی مەلا عبدالله مزگەوتی شێخی چۆلی بۆ پیرۆزبایی هاتە سەردانی و دوو فەقێی لەقۆناغی موستەعیدی بۆ هێناو داوای لێکرد دەرسیان بداتێ. بەهاتنی ئەو دوو موستەعیدە، دەرگای حوجرە لەم مزگەوتە کرایەوە، چەند فەقێیەکی تریش هاتن و ژمارەیان گەیشتە شەش حەوت کەس.

بۆ (٤٠) ساڵ دەچێ، لەم مزگەوتە حوجرە کراوەتەوەو جەنابی مامۆستا دەرسی تیا دەڵێتەوە.

* * *

* ئەرکی بەڕێوەبردنی ئەم حوجرەیە، بەپلەی یەکەم کەوتۆتە ئەستۆی (جەنابی مامۆستاو، کاك سەید عمر سەید غریب و هەندێ لەخێرخوازانی گەڕەکەکە).

* لەم مزگەوتە ژوورێکی گەورە لەسەر ژووری گۆڕستانەکە بۆ حەوانەوەو پشوودانی فەقێیەکان تەرخان کراوە، بەڵام لەکاتی دەرس و دەور هەر لەحوجرەی مامۆستا کۆدەبنەوە.

* وەکو سەرجەم حوجرەکانی کوردستان، ڕۆژانی هەینی و سێ شەممە، ڕۆژی پشوودانە، ڕۆژانی دیَ هەر ڕۆژەك دوو دەرسیان هەیە.

* لەماوەیَ ئەم چەند ساڵەی رابردوو، دەیان فەقێ لەم حوجرەیە بوونەتە مەلاو بڕوانامەی مەلایەتیان لەمامۆستا مەلا بهاءالدین وەرگرتووە، لەوانەی کە لە ڕۆژی ٢٠٠٣/٩/٢٢ خوێندنیان تەواو کرد.

١- مامۆستا مەلا سامان انور بناوی.

---

1- بڕوانە لاپەڕە (٣٩٧) لەکتێبی (کورتەیەك لەژیاننامەی زانا ئایینیەکان)، نووسینی (بەندە)و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف.

٢- مامۆستا مەلا هندرێن جعفر باليسانی

٣- مامۆستا مەلا فەریدون نوری باليسانی

٤- مامۆستا مەلا نجاة خەیلانی.

وەجبەی دووەم: لە ٢٠٠٤/٩/١٨

١- مامۆستا مەلا رزگار عبدالله شێخ بزێنی

٢- مامۆستا مەلا سەید سعید بەرزنجی

٣- مامۆستا مەلا کامران سلام هەروتەیی

٤- مامۆستا مەلا طاهر محمد احمد هەروتەیی

٥- مامۆستا مەلا محمد عمر عولاٚ هەروتەیی

سەرەڕای فەقێیەکانی خۆی، دەیان کەس بڕوانامەی مامۆستا مـەلا بهاءالـدین یان وەرگرتووە، لەوانە:

١- مامۆستا مەلا احمد وەرتێ

٢- مامۆستا مەلا یونس هەروتەیی

٣- مامۆستا مەلا عبدالمقتدر تارینی

٤- مامۆستا مەلا عبدالجبار باویان

٥- مامۆستا مەلا طاهر وەرتێ

٦- مامۆستا مەلا صباح سورچی

٧- مامۆستا مەلا رشید هەرکی

٨- مامۆستا مەلا محمود هەرکی

ئەوەی شایانی وەبیر هێنانەوەیە. مامۆستا (لقمان مەلا بهاءالدین) کەهەڵگری بڕوانامەی ماسـتەرە، نـاو بـەناو دەرس بەقێیـەکانی بـاوکی دەڵێ‌و هاوکاریکە بـۆ جەنابی مامۆستا.

لــەم مزگــەوت و حوجرەیــە، تــاکو ئــەمڕۆ دوو وەجبــە فــەقێ خوێنــدنیان تەولوکردووەو، ئاهەنگی دەرچوونیان بۆ ساز دراوە، دەیان زاناو کەسایەتی ناودارو نوێنەری ئەوقاف و جەماوەر بەشداری ئەم دوو ئاهەنگەیان کردووە.

١- یەکەم لەرۆژی ٢٠٠٣/٩/٢٢

٢- دووەم لەرۆژی ٢٠٠٤/٩/١٨

لەولنەی لەم ئاهەنگانە بەشداریان کردووە

١- مامۆستا مەلا سەید عبداللەی گردەسۆری

٢- مامۆستا مەلا ممدوح مزوری

٣- مامۆستا مەلا حمدامین رەواندزی

٤- مامۆستا مەلا محمد صادق ویسی گرتکی

٥- مامۆستا مەلا ابو بکر قیرێژەیی

٦- جەنابی کاك عثمان رشاد موفتی، بەڕێوەبەری گشتی دیوانی وەزارەتی ئەوقاف لەهەرێمی کوردستان- هەولێر.

٧- بەڕێز حاجی نوری- بەڕێوەبەری ئەوقافی هەولێر.

٨- بەڕێز حاجی سمیع مەلا عمر مەلا قەرەیی، کارمەندی بەڕێوەبەرایەتی ئەوقاف.

ئەوەی جێگای خۆشحاڵییە، تەواوی ئەرکی دابین کردنی پێداویستی ئەم ئاهەنگانە لە ئەستۆی ئەم بەڕێزانە بووە:

١- جەنابی حاجی محمد امین حاجی صدیق قیرێژەیی

٢- جەنابی سەید عمر سەید غریب بەرزنجی

٣- جەنابی حاجی عبداللەی چیوەیی

٤- جەنابی حاجی عزیز حاجی بدیع چیوەیی

٥- مامۆستا مەلا جعفر جدیدە

٦- مامۆستا مەلا سیامند حاجی جلال

ئەمەش ناوی فەقێیەکانی ئێستای حوجرەکان

١- مەلا ادریس حسین عزیز

٢- مەلا صالح حاجی باپیر خدر

٣- مەلا هێمن علی احمد

٤- مەلا زێوەر حمە صالح

٥- مەلا یعقوب حسین عبدالکریم

٦- مەلا سەنگەر محمەد رسول

٧- مەلا دیدار محمد خدر

٨- مەلا فرهاد روؤف حسین

٩- مەلا خالص مەلا سەید رسول سلێمان

شەممە ٢٠٠٦/٨/٥

سەرچاوەکان:

١- سەردانی حوجرەکە لەنزیکەوە.

٢- دیدەنی جەنابی مامۆستا مەلا بهاءالدین.

٣- دیدەنی جەنابی کاک سەید عمر سەید غریب بەرزنجی.

٤- کتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکان) نووسینی (بەندە)و بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف لەهەرێمی کوردستان- ٢٠٠١ هەولێر.

٥- گۆڤاری (خۆری ئیسلام) ژمارە (٢٩) ساڵی ٢٠٠٥.

# (حوجرەی مەلا عبداللەی پەرپیتانی)(1)



ئەم حوجرەیە سەر بەمزگەوتی عبدالقادر شنۆییە (سپی)(2) لەسەر شەقامی (٦٠) مەتری تەنیشت هۆڵی بۆنەکانی سەر بەوەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی.

سەرەتای دامەزراندنی بۆ ساڵی (١٩٨٠) دەگەڕێتەوە، لەکاتی خۆی خوالێخۆشبوو (مامۆستا مەلا عبدالله)ی پەرپیتانی بەدروست کردنی هەستاو

1- ناوی تەواوی (مەلا عبدالله مولود محمود خەجێ) بوو، لەدایك بووی ساڵی (١٩٤٣ز)ی گوندی پەرپیتان بوو، مجازی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا صالح کۆزەپانکە بوو، لەرۆژی (٢٠٠٤/٢/١) لە بەسەرهاتە دڵتەزێنەکەی جەژنی قوربان، لەلقی/٢ (پ.د.ك) لەگەڵ دەیان کەسایەتی شەهید کرا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە لاپەڕە (٣٤٤) لەکتێبی ژیاننامەی زانا ئایینیە کۆچکردووەکانی هەولێر، دانانی (بەندە)و بلاْوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف (هەولێر- ٢٠٠٤).

2- بۆ زیاتر شارەزابوون لەمێژووی ئەم مزگەوتە، بڕوانە لاپەڕە (١٢٩) لەکتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی ناو شاری هەولێر، نووسینی (بەندە) و نۆبەرەی بلاْوکراوەکانی وەزارەتی ئەوقاف لەهەولێر ٢٠٠١.

هەر خۆشی ئەرکی تەدریسی تیا لەئەستۆ گرت، ئەم زاتە ماندووبوونێکی زۆری دی تاکو تەواوبوو.

بۆ ماوەی نزیک (١٣) ساڵ، خوالێخۆشبوو لەم حوجرەیە زانستیەکانی ئایینی بەفەقێیان ووتەوە، بەدەیان کەس لەم حوجرەیە فەقێیایەتیان کرد، لەوانە:

١- مەلا هادی

٢- مەلا علی

٣- مەلا عبدالله

٤- خوالێخۆشبوو مەلا محمد باتاسی

٥- مەلا محمد بەستەسێنی

٦- مەلا ناصر باشوری

٧- مەلا یونس سەید عبداللەی قەڵاتکە

٨- مەلا خلیل

٩- مەلا مظهر شێخ ظاهر نەقشبەندی

١٠- مەلا عمر شێخ طاهر نەقشبەندی

١١- مەلا ویسی مەلا سعید

١٢- مەلا اسامە مەلا عبدالواحد

١٣- مەلا جمعة خدر حمد چۆمانی

١٤- مەلا رسول مەلا محمد

١٥- مەلا ادریس مەلا محمد بەنەسلاوە

١٦- مەلا سیامند حمدامین

ئەم حوجرەیە، هەر لەقۆناغی یەکەمەوە، فەقێیان هەبوو تاکو دەگەیشتە دووامادەکان (قۆناغی موستەعیدی تەواو)، بەدەیان ماموستای ئایینی لەم

حوجرەیە خوێندنیان تەواوکردو لەسەر دەستی مامۆستا مەلا عبداللەی پەرپیتانی بڕوانامەی مەلایەتیان وەرگرت لەوانە:

١- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا محمد باتاسی

٢- مامۆستا مەلا محمدی بەستەسێتی

٣- مامۆستا مەلا سعدالدین مەلا عبداللەی کوڕی.

بەڵام زۆر بەداخەوە، پاش دەیان ساڵ بەشەهیدبوونی ئەم زاتە رەوڕەوەی خوێندن لەم حوجرەیە وەستاو، ماوەی یەک دوو ساڵە داخراوە...

**چۆن ئەم حوجرەیە بەڕێوە دەچوو**

هەر لەسەرەتای کردنەوەیەوە، دەیان کەسایەتی خێرخواز بۆ بەڕێوەبردنی ئەم حوجرەیەو دابین کردنی پێداویستیەکانی قۆڵیان لێهەڵکردو بەهەموو شێوەیەک یارمەتی و کۆمەکی حوجرەکەیان دەکرد لەوانە:

١- خانەوادەی حاجی انور.

٢- خانەوادەی حاجی حەوێز.

٣- خانەوادەی حاجی مصطفى

٤- مامۆستا مەلا زلفی سورچی

٥-ماڵی دایکی شاخەوان.

سەرەڕای ئەو خانەوادانەی کەئاماژەمان بۆ کردن، چەند کەسایەتی دی هەبوون، راستەوخۆ رۆژانە یارمەتی فەقێیانی ئەم حوجرەیەیان دەدا، لەوانە

١- مام عبداللە کریم شریف نانەوا.

هەموو رۆژێ نانی گەرمی بەیانیانی تەواوی فەقێیەکان لەسەر ئەو بوو.

٢- مام رحمن محمد مصطفى شێخانی:

ئەم زاتە لەدابین کردنی (توێک و ماست)ی فەقێیان بەرپرس بوو، هەموو سەر مانگێک پارەکەی لەجەنابی مامۆستا مەلا عبداللە وەردەگرت.

لەهەمووی سەیرتر، ماوەیەکی زۆر جەنابی مامۆستا (مانگا- چێڵ)یەکی کڕی و ڕۆژانە ماستی فەقێیان لەبەروبوومی ئەو مانگایە دەهاتەدی.

* * *

مەدرەسەکە، لەیەك دوو ژوورو حەمام و ئاودەست پێك هاتبوو لەگەڵ جێگای تایبەت بۆ خواردن ئامادەکردن، ژوورێك بۆ خوێندن و ئەویتر بۆ حەسانەوە.

ئەمە بوو کورتەیەك لەمێژووی ئەم حوجرەیە.

شەممە ٢/١٢/٢٠٠٦

**سەرچاوەکان:**

١- سەردان و دیمانە لەگەڵ جەنابی مامۆستا مەلا سعدالدین مەلا عبداللە پەرپیتانی، ئیمام و خەتیبی مزگەوتی سپی و ئەندامی پەرلەمانی کوردستان. بەڕێوەبەری پەیمانگای ئایینی لە مزگەوتی (الصواف).

٢- راپۆرتە دەست نووسەکەی مامۆستا صلاح الدین مەلا عبداللە لەمەڕ ئەم حوجرەیە.

٣- کتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی ناو شاری هەولێر) دانانی بەندەو بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقافی هەرێمی کوردستان (هەولێر ٢٠٠١). لاپەرە (١٢٩).

٤- کتێبی (کورتەیەك لەژیاننامەی زانا ئایینیە کۆچکردووەکان لەهەولێر، نووسینی (بەندە)و بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف لەهەرێمی کوردستان (هەولێر ٢٠٠٤).

# ( حوجرەی مزگەوتی شەهید نجم الدین )[1]



( وێنەی مامۆستاو هەندێ لە فەقێیەکانی حوجرە )

ئەم حوجرەیە کەوتۆتە ناو مزگەوتی ناوبراو لەگەڕەکی (حی العلماء) عەردی مەلایان لەشاری هەولێر، نزیک گەڕەکی گوێستان لەلایەک، شۆڕش لەلایەکی دی، سەرەتای دروست بوونی بۆ سەرەتای دامەزراندنی مزگەوتەکە دەگەڕێتەوە. ساڵی (١٩٨٢)ە هەرکە مزگەوتەکە بنیات نراو تەواو بوو، مامۆستا مەلا (عبدالقادر مەلا سلیمان مەلا محمد بەحرکەیی)[2] ئاشۆکەیی لەم مزگەوتە

---

1- بۆ زیاتر شارەزابوون لەمێژووی ئەم مزگەوتە، بڕوانە لاپەرە (٢٢٤) لەکتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی ناو شاری هەولێر) دانانی (بعندە)و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف). هەولێر ٢٠٠١.

2- مامۆستا لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٠)یەو لەساڵی (١٩٥٩) خوێندنی مەلایەتی تەواوکردو مجازی خوالێخۆشبوو مەلا عبداللەی برایەتی، هاوکات بڕوانامەی (١٢) عیلمی لەساڵی (١٩٦١)وە هەیە. زیاتر لە (٤٠) ساڵە ئەم زاتە لەسنووری ئەم شارە خزمەتی ئاین دەکات.

کرایە ئیمام و خەتیب. هاوکات مامۆستا ئەرکی تەدریسی لەحوجرەی ئەم مزگەوتە گرتە ئەستۆ.

هەر بەکردنەوەی حوجرەکە، دەیان فەقێی لێ کۆبوونەوەو هانایان بۆ برد بەدرێژایی ئەم ماوەیە کەخۆی لەنزیك (٢٥) ساڵ دەدا، بەلای کەمەوە هەموو وەختی (حەوت هەشت) فەقێی هەبووە.

شان بەشان مامۆستا مەلا عبدالقادر بەحرکەیی، چەند زانایەکی دی هەن لەم حوجرەیەدا دەرس دەڵێنەوە لەوانە:

١- مامۆستا مەلا ابراهیم شێخ طه هەرشەمی[1]

٢- مامۆستا مەلا احمد سلیمان محمد رانیەیی[2]

٣- مامۆستا مەلا محمد سمایل برایم، کە بە (مەلا محمدی بیرێژەیی) بەناو بانگە.

ئەرکی بەڕێوەبردنی ئەم حوجرەیەش لەئەستۆی خێرخوازانی گەڕەکی دەوروبەری مزگەوتە، بەتایبەتی جەنابی کاك (حاجی تحسین حاجی کریم)[3]، لەهەمان کات، دەزگای ئەوقافیش، مانگانە بڕێك خەرجی بۆ هەر یەکێ لە فەقێیەکان وەکو کۆمەك تەرخان کردووە.

پەیڕەوپرۆگرامی فەقێیانی ئەم مەدرەسەیەش، لەشێوە پرۆگرامی حوجرەکانی دی دەچێ. لەم مزگەوتە، فەقێیەکان، (٢) دانە ژووریان هەیە ژوورێك بۆ دەرس خوێندن، ئەویتر بۆ پشوو و حەسانەوە. هاوکات ژووری چێشتخانەشیان هەیە.

ناوی فەقێیەکانی ئەم کاتەی حوجرە

١- مەلا هەژار احمد بالیسانی

---

1- ئەم زاتە ئیمامە لەمزگەوتی شێخ مصطفی-ی نەقشبەندی.

2- ئەم زاتە ئیمامە لەمزگەوتی شەهید نجم الدین.

3- ئەم زاتە خەڵکی گوندی بەحرکەیەو ماوەیەکی زۆرە هاتۆتە هەولێر.

٢- مەلا نوح علی احمد زیارەتی

٣- مەلا یاسین حاجی تحسین

٤- مەلا یاسین مەلا قادر بەحرکەیی

ناوی ئەو فەقێیانەی کە لەنێوان ساڵی ١٩٩١ تاکو ساڵی (٢٠٠٦) لەم حوجرەیە خوێندویانە:

١- مەلا جعفر عبدالمجید گوانی

٢- مەلا طه کارسول سورچی

٣- مەلا ادریس سورچی

٤- مەلا هیمداد عبدالرحمن گەردی

٥- مەلا عبدالصمد ابراهیم گەردی

٦- مەلا عاصم گوانی

٧- مەلا محمد گاینجی

٨- مەلا محمد کمال زیارەتی

٩- مەلا حیدر مەلا ظاهر گاوانی

١٠- مەلا محمد جعفر زیارەتی

١١- مەلا محمد شێخانی، باوەیی

١٢- مەلا کامران سورچی

١٣- مەلا مادح رەواندزی

١٤- مەلا مهدی برادۆستی

١٥- مەلا عبدالمجید هەریری

١٦- مەلا عبدالرحمن اسماعیل علی

١٧- مەلا زکریا عبدالرحمن خۆشناو

١٨- مەلا فریاد سورچی

١٩- مەلا فاخر خەیلانی

٢٠- مەلا دلشاد سورچی

٢١- مەلا علی هەرکی

٢٢- مەلا طلعت

٢٣- مەلا موسی

٢٤- مەلا اسماعیل محمد گەڕاو

٢٥- مەلا سالار یاسین براغی

تەواوی ئەو ناوانەی کەئاماژەمان بۆ کردن، ڕۆژێ لەڕۆژان فەقێی ئەم حوجرەیە بوون. هەندێ لەو زاتانە، پاش تەواوکردنی خوێندنی مەلایەتی لەم حوجرەیە، ئەوسا چوونە (پەیمانگای خوێندنی ئایینی) سەر بە ئەوقاف لەهەولێر.

ئەمە بوو چەند دێڕێك لەمێژووی حوجرەی مزگەوتی شەهید نجم الدین لەهەولێر.

شەممە ٢٠/٥/٢٠٠٦

**سەرچاوەکان:**

١- سەردانی حوجرەکە لەنزیکەوە، لەکاتی دەرس خوێندن.

٢- دیدەنی ئەم بەڕێزانە:

أ- مامۆستا مەلا عبدالقادر گەردی، ئاشوکانی.

ب- مامۆستا مەلا محمد سمایل براهیم

ج- مامۆستا مەلا یاسین مەلا قادر گەردی.

# حوجرەی ابوبکری الصدیق[1]



(وێنەی هەندێ لە فەقێیەکانی حوجرە)

ئەم حوجرەیە، سەر بەمزگەوتی (شەهید ابراهیم اسماعیل)ە لەگەڕەکی ڕاپەڕین لەهەولێر. سەرەتای کردنەوەی لەڕۆژی (١٩٨٤/٤/٤) بوو، لەیەکەم ڕۆژەوە ئەم ناوەیان لێنا، هەر لەو ڕۆژەشەوە (مامۆستا مەلا محمد مەلا قادر وەرتێ)[2] ئەرکی لایەنەکانی تەدریس و ئیمامەتی و ووتار خوێندنەوەی لەئەستۆ گرت، ژمارەی فەقێیانی لەنێوان (٥-١٠) فەقێ بوونە، بەلاّم لە (٥) کەس کەمتری تیا نەبووە، زۆرینەی فەقێیەکانی لەقۆناغی موستەعیدین، چ لەتازە موستەعید چ لەدووا مادەکان. لەماوەی ئەم چەند ساڵە، (٥) زانای ئاینی بڕوانامەی مەلایەتی لەسەر دەستی مامۆستا مەلا محمد وەرگرتووە چواریان فەقێی ئەم مەڵبەندە بوونەو یەکێ فەقێی مزگەوتێکی دی لەکوردستان.

لەم مزگەوتەش وەکو سەرجەم مزگەوتەکانی تری کوردستان بڕوانامەدان، ڕێورەسمی تایبەتی خۆی هەبووە ئاهەنگی گونجاوو شیاوی بۆ ساز دراوە،

1- بڕوانە لاپەرە (٢٠٦) لەکتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی هەولێر) لەنووسینی (بەندە)و نۆبەرەی بلاّوکراوەکانی وەزارەتی ئەوقاف لەهەرێمی کوردستان هەولێر ٢٠٠١.

2- ئەم زاتە لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٠) و لەگوندی وەرتێ لەدایکبووە لەساڵی ١٩٦١وە خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووەو لەساڵی (١٩٤٥)وە سەرقاڵی مەلایەتیە.

بەدەیان زاناو کەسایەتی بەشداریان لەوەها ڕێورەسمێك دەکرد لەو ئاهەنگانەی کە لەم حوجرەیە ساز دراوە، ئەمانەن

١- ئاهەنگی بڕوانامە بەخشین، لەڕۆژی ٢٠٠٣/٩/٢٥ ئەم ئاهەنگە، تەنها بۆ بەخشینی بڕوانامە بۆ مامۆستا مەلا (رسول حمە امین رسول) ساز دراوە.

٢- ئاهەنگی رژی ٢٠٠٥/٩/١٧ پاش دوو دانە ساڵ، لەدوایی ئاهەنگی یەکەم کەئاماژەمان بۆ کرد، لەهەمان حوجرەو بەهەمان شێوە، سێ زانای دی، مۆڵەتی مەلایەتیان وەرگرت کەئەمە ناویانە.

ا- مامۆستا مەلا رقیب رسول حسن

ب- مامۆستا مەلا فرمان محمد میر

ج- مامۆستا مەلا هێمن حاجی باقی خدر

سەرەڕای ئەم زانایانە، جەنابی مامۆستا بڕوانامەی مەلایەتی بەجەنابی مامۆستا مەلا (محمد معروف خدر)[1]یش داوە.

ناوی ئەو فەقێیانەی کەئەمڕۆ لەم حوجرەیە دەخوێنن.

١- مەلا لقمان احمد حسین سمیلان

٢- مەلا رسول خدر رسول قەڵادزەیی

٣- مەلا کارزان سعید صالح

٤- مەلا احمد محمد عبدالله

٥- مەلا یعقوب محمدامین رسول

٦- مەلا رزگار فائق عبدالعزیز

* * *

1- ئەم زاتە لەرۆژی ٢٠٠٥/٩/١٧، هاوکات لەگەڵ ئاهەنگی دووەمی ئەم حوجرەیە، کۆچی دوایی کرد.

کاتی خۆی ئەم حوجرەیە تەنها ژوورێکی هەبوو، بەلاّم پاش نۆژەنکردنەوەی مزگەوتەکەو دامەزراندنی لەسەر ئەم شێوەیە.

٢- ژوور و چێشتخانەیەکیان بۆ کرا، هاوکات ئاودەست و سەرشۆری خۆیان هەیە.

ئەرکی بەڕێوەبردنی کاروباری فەقێیەکانی ئەم حوجرەیە لە ئەستۆی خەڵکی گەڕەکەکەیەو هەندێ خێرخوازان، لەوانە:

١- خوالێخۆشبوو کاك عبدالخالق دوکاندار، (عبدالخالق ماست فرۆش).

٢- بنەماڵەی (خانەوادەی) کاك کمال مەلا سعید وەرتێ.

شێوازی خوێندن لەم حوجرەیە، لەشێوەی حوجرەکانی تری کوردستان دەچێ، هەفتەی (٥) رۆژ دەرسیان هەیە، هەموو رۆژێك پاش نیوەڕۆ دەستی پێدەکەن هەر فەقێیەك دەرسی تایبەتی خۆی هەیە، ئەوەی دەرسەکەشی رەوان نەکردبێ، دەرسی نوێ وەرناگرێ، هەندێ لەفەقێیەکان، مانگانە، بەڕێوەبەرایەتی ئەوقاف کۆمەکیان دەکات و بڕی (١٥) پانزە هەزار دیناری ئەم سەردەمەیان دەداتێ.

ئەمەبوو، کورتەیەك لەبارەی ئەم حوجرەیەوە.

چوارشەممە

٢٠٠٦/٨/٣٠

سەرچاوەکان:

١- سەردانی حوجرەکە لەنزیکەوە

٢- کتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی شاری هەولێر) نووسینی (بەندە)و بلاّوکراوەی وەزارەتی ئەوقافی هەرێمی کوردستان- هەولێر ٢٠٠١.

٣- سەردان و دیدەنی ئەم زاتانە

أ- مامۆستا مەلا محمد مەلا قادر وەرتێ

ب- مامۆستا مەلا لقمان احمد سمیلان

# حوجرەی مزگەوتی حاجی یەحیا[١]



( وێنەی هەندێ لە فەقێیەکانی ئێستای حوجرەکە )

ئەم حوجرەیە، سەر بەمزگەوتی ناوبراوە، سەرەتای دامەزراندنی بۆ ساڵی ١٩٨٥ دەگەڕێتەوە، کاتی خۆی خوالێخۆشبوو حاجی یەحیا بۆ ئەم مەبەستە یەك دوو ژوری لەسەر هۆڵی پرسەی مزگەوتەکە دروست کرد. هەر لەسەرەتاوە، جەنابی مامۆستا مەلا محمدامین[٢] ڕەواندزی لەم مزگەوتە کرایە (ئیمام و

1- حاجی یحیی سعید خضر باجگرە، لەرۆژی ١٩٨٣/٥/١٧ کۆچی دوایی کردو ئێستاکە کوڕەکانی مزگەوت و حوجرەکە دەبەنە ڕێوە.

2- ئەم زاتە لەدایك بووی ساڵی (١٩٤١) و لەساڵی (١٩٦١)وە خوێندنی تەواو کردووە، هەڵگری بڕوانامەی مەلایەتی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبدالکریم مەلا اسعد مەلا عمر ئەفەندی خەیلانی ڕەواندزییە.

خـەتیب و مـودەریس) شـان بەشـانی مامۆسـتا مـەلا محمـدامین، چـەند مامۆستایەکی تریش دەرسیان بەفەقێیانی ئەم حوجرەیە وتووە لەوانە:

١- مامۆستا مەلا محمدامین خورخوری

٢- مامۆستا مەلا یاسین سۆرێژەیی

٣- مامۆستا ماهر مامۆستا مەلا حمدامین رەواندزی.

لـەم حوجرەیـە هاوکـات لەگـەڵ دەرسـە دیـاریکراوە ئایینیـەکان، چـەند دەرسێکی تریان هەبوو وەکو:

١- دەرسی زمانی ئینگلیزی

٢- دەرسی ریاضیات و بیرکاری

٣- دەرسی خۆشنووسی و یاساکانی

تەواوی، دابین کردنی پێداویستیەکانی ئەم حوجرەیە لەئەستۆی خانەوادەی خوالێخۆشبوو حاجی یەحیایە.

لەوانە:

١- دابینکردنی تەواوی پێداویستی حوجرەکە لەهەموو لایەکەوە.

٢- ساڵی دووجار بەرگ بۆ فەقێیەکان.

٣- برینەوەی مووچەیەك بۆ ئەو کەسانەی کە لەم حوجرەیە دەخوێنن، تاکو پاش تەواوکردنی، هەیە چەند ساڵە خوێندنی تەواوی کردووە، لەلای بنەماڵەی حاجی (یەحیا) موچەی هەیە.

٤- دابین کردنی کتێبخانەیەکی گەورەو پڕکردی لەکتێب و سەرچاوەکان.

شێوازی خوێندن لەم حوجرەیە

لەم حوجرەیـەش، وەکو هـەموو حوجرەکـانی تـری کوردسـتان، هەفتـەی (٢) رۆژ مۆڵـەتیان هەیـەو تیایـدا پـشوو دەدەن، کـەرۆژی سـێ شـەممەو هەینییـە سـەرەڕای دەرسـە دیاریکراوەکانیـان، نـاو بـەناو لەلایـەن مامۆسـتاوە تاقیدەکرێنەوە بۆ دەرکەوتنی ئاستی فێربوونی دەرسەکانیان دەکرێ.

## خوێندن لەم حوجرەیە

لەم حوجرەیە، تەواوی فەقێیەکان لەقۆناغی موستەعیدیدان، لەکتێبەکانیان

١- کتێبی جمع الجوامع

٢- کتێبی المختصر

٣- کتێبی البلاغة

٤- کتێبی منطق

٥- کتێبی بیضاوي

٦- کتێبی حدیث

٧- کتێبی تحفة

٨- کتێبی نحو صرف

لەماوەی ئەم چەند ساڵە، نزیکەی (٢٠) کەس لەم حوجرەیە کۆتاییان بەخوێندن هێناوەو بڕوانامەی مەلایەتیان وەرگرتووە لەوانە:

١- مەلا فاخر سارتکەیی

٢- مەلا علی کانی بی

٣- مەلا فکری رۆستێ

٤- مەلا فتح الله کانی مازولی

٥- مەلا عبدالرحمن

٦- مەلا محمد بۆسکینی

٧- مەلا علی ئاشقولکەیی

٨- مەلا عمر وەرتێ

٩- مەلا ئاراس رەواندزی

١٠- مەلا علی هەرتەلی

١١- مەلا اسماعیل کفرە دۆڵی

١٢- مەلا ادریس کانی وەتمان

١٣- مەلا عثمان كانی كوردە

١٤- مەلا سليمان مەنتك

لەكاتی سەردانیمان بۆ ئەم حوجرەیە لەرۆژی (٢/ ربيع الاول/ ١٤٢٧ بەرامبەر بە ٢٠٠٦/٤/١) حەوت فەقێ سەرقاڵی دەرس خوێندن بوون. لەوانە:

١- مەلا علی موسى حمزە

٢- مەلا فاتح سليمان حمد

٣- مەلا محمد سعيد حكيم

٤- مەلا عبدالعزيز جبار احمد

٥- مەلا هندرين شێركۆ

٦- مەلا عبدالله مجيد حمدامين

٧- مەلا مولود فاضل

## چەند خاڵێكی پرشنگدار

١- زۆربەی فەقێیانی ئەم حوجرەیە، بۆ وتار خوێندنی رۆژی هەینی هەر یەك روو لەمزگەوتی گوندێكی ئەم دەوروبەرە دەكەنو فەرزی نوێژی هەینی بۆ خەڵكی ئەنجام دەدەن.

٢- ماموستا مەلا (علی قازی) یەكەم كەسبوو لەم حوجرەیە خوێندنی تەواوكردو بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرت.

٣- یەكەم حوجرە بوو لەسەرەتای ساڵانی هەشتاكان كرایەوەو فەقێی لەئامێز گرت.

٤- دەرچووانی ئەم حوجرەیە، تاكو ئەمڕۆش مانگانە مووچەی خۆیان لەلایەن بنەماڵەی حاجی یەحیاوە هەیە.

ئەوەی پێویستە كەئاماژەی بۆ بكەم، نەك بەتەنها لەم حوجرەیە، بگرە لەزۆربەی حوجرەكانی ئەم سەردەمەی شاری هەولێر، خوێندن بەرەو لاوازی

دەچێ، ژمارەی فەقێ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەکورتیدایە. هۆیەکانیشی لەدوو تویێی ئەم کتێبە ئامارژەی بۆ کراوە.

ئەمە بوو، چەند لایەنێك لەمێژووی ئەم حوجرەیە

شەممە

٢٠٠٦/٤/١

**سەرچاوەکان:**

١- سەردانی حوجرەکە لەنزیکەوە.

٢- سەردان و دەمەتەقێ لەگەڵ خودی مامۆستا حمدامین ڕەواندزی مودەریسی حوجرە.

٣- کتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی هەولێر) لەنووسینی (بەندە)و نۆبەرەی بلاوکراوەکانی وەزارەتی ئەوقاف- هەولێر ٢٠٠١.

# حوجرەو مەدرەسەی سلمان پاك[1]



(وێنەی مامۆستاو هەندێ لە فەقێیانی حوجرە)

ئەم حوجرەیە سەر بە (مزگەوتی حاجی ابراهیم گەردی)یە[2] لەگەڕەکی برایەتی، سەر ڕێگای کۆیێ، نزیك نەخۆشخانەی رزگاری، سەرەتای دامەزراندنی بۆ ساڵی (١٩٨٨) دەگەڕێتەوە، کاتی خۆی مامۆستا مەلا عمر[3]

---

١- سلمان پاك ناوچەیەکە لەخۆرهەڵاتی شاری بەغداو لەبنەرەتدا بەناوی هاوڕێ پێغەمبەر (د.خ) (سلمان فارسی)یە نراوە.

2- بۆ زیاتر شارەزابوون لەمێژووی مزگەوتە، بڕوانە لاپەرە (٢٨٧) لەکتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی هەولێر) نووسینی (بەندە)و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف لەهەولێر- ٢٠٠١.

3- ئەم زاتە لەساڵی (١٩٨٨-٢٠٠٠) لەم مزگەوتە بوو، ئێستاکە لەمزگەوتی (الصواف)ە ئیمام و ووتار خوێنە،و مجازی مامۆستا مەلا سەید عبداللەی گردە سۆرییە.

مەلا حمدامین سوێری دروستی کرد. بەهەوڵ و تەقەلای مامۆستا مەلا عمرو حاجی ابراهیم گەردیو خێرخوازانی دەوروبەری مزگەوت، بەتایبەت (شێخ بروێن)[1] ، حوجرە کە هاتە دروست کردن.

لەسەرەتاوە ناوی (حوجرەی ئیمام شافعی بوو، کاتێ کەمامۆستا مەلا (محمد[2] صادق ویسی گرتکی) لەساڵی (٢٠٠٠) هاتە ئەم مزگەوتە، ناوەکەی بۆ سلمان پاك گۆڕا. لەو رۆژەوە کەئەم حوجرەیە لەم مزگەوتە کراوەتەوە، بەلای کەمەوە، لە (٦-٨) فەقێی کەمتر نەبووە، زۆر بەیان لەقۆناغی (موستەعیدیو دووامادە)، سەرەرای فەقێیەکانی ئەم حوجرەیە، زۆرجار هەبووە، فەقێیەك لەشوێنێکی دی، حوجرەیەکی دی، خوێندنی تەواوکردووە، بەلام بۆ بڕوانامە هاتۆتە لای ئەم زانایە، مامۆستا مەلا محمد صادق گرتکی بڕوانامەکەی بۆ مۆرکردووە.

## شێوازی خوێندن لەم حوجرەیە

لەم حوجرەیەش، وەکو حوجرەکانی تری ئەم شارە، رۆژانە (٢) دەرسیان لەبابەتە ئایینیەکان هەیە، یەکێ لەدەرسە زانستییەکان، ئەویتر لەدەرسە

---

1- ئەم زاتە خۆی بەسەیدەکانی (نهری) دادەناو، پیاو ماقوڵ و ردێن سپیو دراوسێی مزگەوتەکەیە.

2- لەسەرەتاوە بەم ناوە دروست کرا، تاکو هاتنی مامۆستا مەلا محمد صادق گرتکی، لەبەر ئەوەی لەناحیەی (سلمان پاك)وە گەڕابۆوە هەولێر، ناوی حوجرەکەیان گۆڕی. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە لەو سەردەمە زیاتر لەحوجرەیەك بەناوی (ئیمام شافعی)وە لەم شارە هەبوو.

3- ئەم زاتە لەدایکبووی ساڵی (١٩٣١) و لەساڵی (١٩٥٩)وە بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرتووە. مجازی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا صالح کۆزەپانکەیە لەساڵی (١٩٧٩) لەسەر بڕیاری خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبدالکریم مدرس، رەوانەی ناحیەی (سلمان پاك) کراو تاکو ساڵی (٢٠٠٠) لەوێ بەمەلایەتی مایەوە.

شەرعییەکان، وەکو (نحو، صرف، بلاغة، فیقە، منطق، اصول الفقة، العلوم العقیدیةو الفرائضیة). سەرەڕای دەرس خوێندن، هەندێ کات بەرامبەر لەیەك دەگرن و وەکو (مناظرە) پرسیار ئاراستەی یەکتر دەکەن و چاوەڕوانی وەڵامی بەرامبەر دەبن.

## یارمەتی دەزگای ئەوقاف بۆ حوجرەکان

دەزگای ئەوقاف لەهەرێمی کوردستان، بەتایبەت لەشاری هەولێر، چەندین ساڵە کۆمەکی مانگانەی بۆ فەقێیان هەیە، بەڵام بەداخەوە کەمە، خوازیارین لەمە زۆرتر هاوەر لەم حوجرانە بدەنەوەو لەوە زۆرتر کۆمەکیان بکەن و هەندێ لەپێداویستیەکانیان بۆ دابین بکەن. ئەگەر بکری هۆبەیەکی سەرپەرشتی یان بۆ بکاتەوەو ناو بەناو سەردانیان بکات.

## مامۆستاو مودەریسەکانی ئەم حوجرەیە

ماوەی شەش حەوت مانگێك دەبێ، مامۆستا مەلا محمد صادق گرتکی، بەهۆی تەمەن گەورەیی و کەم توانایی لەدەرس ووتنەوە دوورکەوتۆتەوە. نەهاتنی ئەم زاتە، بوو بەهۆی سەرهەڵدانی ئەم زانایانە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە پەیدا بووە.

لەو زاتانە:

١- مامۆستا مەلا اسماعیل مەلا نجم الدین سوسەیی، ئیمام و خەتیبی مزگەوتەکە.

٢- مامۆستا مەلا عبدالباسط مەلا جمیل پەرپیتانی ئیمامی دووەم لەهەمان مزگەوت.

٣- مامۆستا مەلا بهاءالدين شێخ احمد عبدالله، ووتارخوێنی مزگەوتی سەید غریب لەگەڕەکی سێتاقان لەهەولێر.

هەفتەی (٥) رۆژ دەرس خوێندن لەم حوجرەیە هەیە.

## ناوی فەقێیەکانی ئێستاکەی حوجرەکە

١- مەلا مسعود فریق عمر گەڕاوی

٢- مەلا علی حسین عبدالقادر- سلێمانی

٣- مەلا ئازاد خالد باڵەکی

٤- مەلا هێمن واحد مصطفی شێخ وەسانی

٥- مەلا شعبان سلیم قادر شەمزینان- گوندی پاراو

٦- مەلا ئارام مناف محمد- پیرئۆمەری- باڵەکی

٧- مەلا صلاح الدين عبدالمتكبر جرجیس- شوانی/ کەرکووك

## ناوی دەرچووانی ئەم حوجرەیە

لەماوەی ئەم چەند ساڵە، چەندین زانای ئایینی لەم حوجرەیە بڕوانامەیان وەرگرت، لەوانە

١- پۆستی یەکەم: ٢٠٠٠/٥/٦

٢- پۆستی دووەم: ٢٠٠١/٩/١١

٣- پۆستی سێیەم: ٢٠٠٢/٢/٩

٤- پۆستی چوارەم: ٢٠٠٣/٦/٢٦

٥- پۆستی پێنجەم: ٢٠٠٤/٥/١٠

٦- پۆستی شەشەم: ٢٠٠٥/٥/٢٣

٧- پۆستی حەوتەم: ٢٠٠٥/٩/٢٢

**یەکەم وەجبە: لە ٦/٥/٢٠٠٠**

١- مامۆستا مەلا فارس محمد حسن خۆشناو، پێش نوێژو ووتار خوێنی ئێستای مزگەوتی حاجی مراد لەهەولێر.

٢- مامۆستا مەلا عبدالخالق قادر عبدالله کە بە (کارۆخ) ناسرابوو، ئێستاکە سەرقاڵی کاسبی سەرپێیە.

**دووەم وەجبە: لە ١١/٩/٢٠٠١**

١- مامۆستا مەلا محمد عبدالله رسول ئاکۆیی- لەناوچەی سیدەکانە

٢- مامۆستا مەلا یاسر فاضل السامرائی- لەشاری بەغدا مەلایە

٣- مامۆستا مەلا خیرالله حسن محمد ئاکۆیی- لەمزگەوتی حاجی جمالە لەهەولێر

٤- مامۆستا مەلا شالأو اسماعیل وسو- ناسراو بە (مەلا عبداللەی ماویلی)

**سێیەم وەجبە: لە ٩/٢/٢٠٠٢**

١- مامۆستا مەلا عماد ستار عمر- لەگوندی سۆمەربانە

٢- مامۆستا مەلا عبدالعزیز رسول مصطفی- لەناحیەی هەریر مەلایە

٣- مامۆستا مەلا نوزاد حسین مەلا- لەگوندی بادلیانە

٤- مامۆستا مەلا معروف عبدالله حاجی ئاغا بالەکی- لەبێرکۆت مەلایە

**چوارەم وەجبە: لە ٢٦/٦/٢٠٠٣**

١- مامۆستا مەلا نادر رشید کانی کوردەیی.

٢- مامۆستا مەلا اسماعیل مەلا نجم الدین- ووتار خوێنی ئێستای مزگەوتی حاجی ابراهیم گەردی.

٣- مامۆستا مەلا حسام الدین جودت عمر- خاوەن کتێبخانەی رەسەن لەهەولێر.

٤- مامۆستا مەلا شیرزاد عبدالوهاب عبدالله.

٥- مامۆستا مەلا زرار مەلا محمد صادق گرتکی.

**پێنجەم وەجبە ٢٠٠٤/٥/١٠**

١- مامۆستا مەلا عبدالسلام مەلا جمیل مەلا علی پەرپیتانی- لەگوندی (سیدان) لەناوچەی بەرانەتی مەلایە.

٢- مامۆستا مەلا نجاه حامد قادر مەلەکی- لەگوندی قەسرۆك مەلایە.

**شەشەم پۆست: ٢٠٠٥/٥/٢٣**

١- مامۆستا مەلا حکمت حسن مصطفی- قوتابی کۆلێژی شەریعەیە

٢- مامۆستا مەلا کاروان محمود وسو- قوتابی کۆلێژی شەریعەیە

٣- مامۆستا مەلا احمد محمود احمد- قوتابی خوێندنی بالأیە لەبەغدا

٤- مامۆستا مەلا محمد مەلا عبدالله- کاسبە

٥- مامۆستا مەلا صابر عبدالله محمد- لەگوندی (چۆمبالۆك) مەلایە

**حەوتەم پۆست: ٢٠٠٥/٩/٢٢**

دووا پۆستی دەرچووانی ئەم حوجرەیە ئەم زاتانە بوون

١- مامۆستا مەلا عبدالباسط مەلا جمیل پەرپیتانی- قوتابی کۆلێژی شەریعەیەو ئیمامە لەمزگەوتی ابراهیم گەردی

٢- مامۆستا مەلا جمیل خضر امین سورچی- لەگوندی بەربەیانە

٣- مامۆستا مەلا زرار سلیمان جلال باڵەك- لەگوندی پیرئۆمەرە

٤- مامۆستا مەلا مظهر حمدامین عبدالله باڵەك- لەگوندی گوێزانە

٥- مامۆستا مەلا هیجام عمر علی سورچی- قوتابی کۆلێژی شەریعەیە

٦- مامۆستا مەلا علی مەلا احمد باڵەك- قوتابی کۆلێژی شەریعەیەو ووتار خوێنە لەگوندی (شیرەماوان) لەناوچەی رۆستێ

## ڕێوڕەسمی بڕوانامە دابەشکردن

وەکو باوە لەم حوجرەیەش بەهەمان شێوەی حوجرەکانی کوردستان لەکاتی بڕوانامە دابەشکردن بەسەر تەواوکەرانی خوێندنی ئاییني، هەمان هەنگاو ڕێچکەی کۆن پەیرەو دەکرێ.

## بڕگەو بەرنامەی ئاهەنگەکان

١- خوێندنەوەی (عشرە)یەك لەقورئانی پیرۆز.

٢- ووتاری مامۆستای (مجیز)

٣- ووتاری نوێنەری ئەوقاف

٤- ووتاری نوێنەری فەقێیە دەرچووەکان

٥- چەند سروودو مەدائحێکی ئاييني

٦- پشوودان و خواردنەوەی شەربەت و شیرنەمەني

٧- دابەشکردنی بڕوانامەکان، بەسەر دەرچووان

* * *

وەکو باوە لەکۆنەوە لەحوجرەی ئەم مزگەوتە، سەندوقێك بۆ یارمەتی و کۆمەك کۆکردنەوە هەیە، وەکو سەرچاوەیەکە بۆ پەیدابوون و دابین کردنی خەرجییەك بۆ پێداویستی حوجرەکە. ئەم سەندوقە لەلایەن مامۆستا مەلا عبدالباسط مەلا جمیل پەرپیتانیش، سەرپەرشتی دەکرێ.

لەوانەی کە یارمەتی و کۆمەکی حوجرەکە دەکەن و بەردەوامن لەسەری:

١- جەنابی کاك سوارە

٢- جەنابی کاك غەفور

٣- جەنابی کاك رسول

ئەم زاتانە، خاوەنی نەخۆشخانەی تایبەتی (رسول)ن لەهەولێر.

بەم بۆنەیەوە، جەنابی مامۆستا مەلا محمد صادق گرتکی، سوپاس و پێ زانینی خۆی ئاراستەی ئەم زاتە بەڕێزانە دەکات و هیواداره لەوێنەیان هەر زۆر بێ.

ئەم کورتە باسە، دەربارەی حوجرەی مزگەوتی حاجی ابراهیم گەردی بوو.

پێنج شەممە

٢٠٠٦/٨/٣

سەرچاوەکان:

١- بەسەرکردنەوەی حوجرەکە لەنزیکەوە

٢- سەردان و دیدەنی ئەم بەڕێزانە

ا- مامۆستا مەلا عمر مەلا حمدامین سوێری- وتارخوێنی مزگەوتی (الصواف) لە هەولێر.

ب- مامۆستا مەلا محمد صادق ویسی گرتکی- وتارخوێنو مودەریسی پێشووی مزگەوتی ابراهیم گەردی.

ج- مامۆستا مەلا اسماعیل مەلا نجم الدین سوسەیی- وتارخوێنی ئێستای مزگەوتەکە.

ء- مامۆستا مەلا عبدالباسط مەلا جمیل پەرپیتانی- ئیمامی مزگەوتی ابراهیم گەردی.

# حوجرەی مزگەوتی

# حاجی جمال(١)



ئەم حوجرەیە لەناو مزگەوتی حاجی جمال بەزاز بوو لەگەڕەکی موفتی لەهەولێر. سەرەتای دامەزراندنی بۆ پایزی ساڵی (١٩٩١) دەگەڕێتەوە، بەچەند مانگێک پاش راپەڕینە مەزنەکەی گەلی کورد لەو ساڵە، لەکۆتایی وەرزی پایز، ئەم حوجرەیە بەهەوڵ و تەقەلاّی

---

1- حاجی جمال بەزاز، ناوی باوکی عبداللەیەو لەدایک بووی ساڵی (١٩٣٢) وە یەکێکە لەکەسایەتیە ناودارەکانی شاری هەولێر.

خاوەن مزگەوت و ماموستا مەلا ممدوح[1] دامەزرا.

کاتێ کەماموستای ناوبراو، لەئێران گەڕایەوە، یەکسەر لەمزگەوتی حاجی جمال کرایە ئیمام و خەتیب و مودەریس هەر بەدامەزراندنی لەم مزگەوتە پیرۆکەی کردنەوەی وەها حوجرەیەك بۆ خوێندن پەیدا بوو، ئامادەسازی تەواوی بۆ کرا، لەسەرەتاوە (٤) فەقێی هەبوو، رۆژ لەدوای رۆژ ژمارەیان بەرزەوە بوو تاکو گەیشتە (١٥) فەقێ.

بەم شێوەیە، حاجی جمال ئەرکی پێداویستی حوجرەکەی لەئەستۆگرت و ماموستا مەلا (ممدوح)یش تەدریس، تاکو سەرەتای پایزی سالی (٢٠٠٥) لەماوەی ئەم چەند سالە، دەیان زانا لەم مزگەوتە فەقێیەتیان کردو لەوانە (٢٢) کەسیان کۆتاییان بەخوێندن هێنا، ئەمەش ناوی هەندێ لەو کەسانە:

١- ماموستا مەلا مسکین حاجی معاص- لەسەروچاوە مەلایە

٢- ماموستا مەلا ادریس زراری- لەهەولێرە

٣- ماموستا مەلا محمود- لەگوندی (زەرگەزەوی)یە

٤- ماموستا مەلا فاروق خۆشناو- لەناوچەی بالیسان مەلایە

٥- ماموستا مەلا بهاءالدین بالەکی- لەناوچەی زرارەتیە

٦- ماموستا مەلا رێبوار- لەگوندی (مەزەحمەدە)

٧- ماموستا مەلا عبدالرحمن حسین- لەکۆمەلگای دارەتووە

٨- ماموستا مەلا طیب مەلا محمد لەکۆمەلگای شاویسە

٩- ماموستا مەلا عزیز رانیەیی- لەکۆمەلگای شاویسە

١٠- ماموستا مەلا محمد کمال- لەشەقلاوە مەلایە.

---

1- ناوی (مەلا ممدوح سلیم نجم الدین)ە لەدایك بووی سالی (١٩٢٨) و بەرەگەز خەلکی گوندی (ئیدلی)یە لەناوچەی برادۆست، لەسالی ١٩٥٦ خوێندنی تەواوکردو لەسەر دەستی خوالێخۆشبوو ماموستا مەلا اسعد مەلا عمر ئەفەندی خەیلانی بروانامەی مەلایەتی وەرگرتووە.

١١- مامۆستا مەلا بارزان شوکت حسين

١٢- مامۆستا مەلا سامی حاجی- ئیمام و خەتیبە لەمزگەوتی گەورەی (ئیمام علی) و هاوکات قوتابی کۆلێژی شەریعەیە لەهەولێر.

ئەوەی شایانی ئاماژە بۆ کردنە، یەکەم دەرچووی ئەم حوجرەیە مامۆستا مەلا (محمد کمال) بوو کەئێستاکە لەشەقلاوە مەلایە.

لەبابەت و کتێبەکانی کە لەم حوجرەیە پەیرەو دەکران

١- کتێبی (علم المنطق)

٢- کتێبی (علم البلاغة)

٣- کتێبی (علم الحکمة)

٤- کتێبی (علم الأوقات)

٥- کتێبی (علم الفلك)

٦- کتێبی (اصول الفقه)

٧- کتێبی (الفقه)

٨- کتێبی (الریاضیات)

٩- کتێبی (تفسیر)

١٠- کتێبی (العروض)

١١- کتێبی (الحدیث)

پاش تەواوکردنی فەقێیەکان، مادەکانیان لەناوەڕاستی ساڵی (٢٠٠٥). مامۆستاش مزگەوتەکەی بەجێ هێشت و حوجرەکەش دەرگاکەی پێوەدرا.

هەموو کۆمەڵێك لەدەرچووان، ئاهەنگی تایبەتی خۆیان بۆ ساز دەدراو، سەدان کەسایەتی لەو ئاهەنگە ئامادە دەبوون و بەشداریان دەکرد.

## چۆنیەتی دابینکردنی پێداویستی ئەم حوجرەیە

لەسەرەتاوە لەسەر داواکاریو پێشنیاری مامۆستا مەلا ممدوح، ئەم حوجرەیە دامەزرا، مامۆستا ئەرکی دەرس ووتنەوەی لەئەستۆ گرت و خاوەن مزگەوتیش تەوەرەکانی دی، لەوانە:

١- دابين كردنی جێگای حەوانەوەو دەرس خوێندن

٢- خۆراك و خواردنەوە

٣- دابین كردنی كتێبخانەیەكی گەورەی پڕ لەسەر چاوە بۆ فەقێیەكان لەناو مزگەوت

٤- لەئەستۆگرتنی پێداویستی ئاهەنگی دەرچوون

٥- یارمەتیو كۆمەك كردنی فەقێیەكان.

بەم دوو زاتە، حاجی جمال و مامۆستا ممدوح، نزیك (١٤) دانە ساڵ، ئەم حوجرەیە گرمەی دەهات، زۆر بەداخەوە ماوەیەكە دەرگاكەی پێوەدراوە، خوازیارم جەنابی حاجی كار بۆ دووبارەكردنەوەی بكاتو ئەم هەنگاوە جوانو خێراوییە فەرامۆش نەكات.

یەك شەممە ٢/٤/٢٠٠٦

## سەرچاوەكان

١- سەردانی حوجرەكە لەنزیكەوە

٢- سەردانی جەنابی مامۆستا مەلا ممدوح لەماڵەوەیان

٣- دیدەنی حاجی محمد علی عارەب- كارمەندی خزمەت گوزاری لەمزگەوتی ناوبراو.

# حوجرەی مزگەوتی

## شێخ محی الدین شێخ محمد صالح بەرزنجی[1]



ئـەم حوجرەیـە سـەر بەمزگـەوتی نـاوبراوە لەگەڕەکی برایەتی نزیك گەڕەکی (بەستەپیازە). سـەرەتای دامەزرانـدنی بـۆ سـاڵی (١٩٩٤) دەگەڕێتـەوە. لەسـەر بڕیـاری مامۆسـتا مـەلا (صـادق مـەلا ابـراهیم خـەتی)[2] و یارمـەتی و کۆمـەککردنی خێرخـوازانی ئـەو دەورەبـەرە بەتایبەت:

١- مەلا رووف مەلا حمدامین گۆمەسپانی[3]

٢- حاجی صالح حاجی رسول قیرێژەیی[4]

ئەم حوجرەیە کرایەوە

لەماوەی ئەم چەند ساڵەی کە حوجرەکەی تیایە کراوەتەوە، هیچ کاتێك لە (٥) فـەقێ کـەمتری نـەبوو، هەنـدێ جـار ژمارەیـان گەیـشتۆتە (١٠) کـەس. لەسـەرەتاوە مامۆسـتا مـەلا بهاءالـدین یارمـەتی مامۆسـتا مـەلا صـادق-ی

---

1- بۆ زیاتر شارەزابوون، بڕوانە لاپەڕە (٢٠٣) لەکتێبی گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی ناو شاری هەولێر) نووسینی (بەندە)و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف (هەولێر- ٢٠٠١).

2- ناوی تەواوی (مەلا صادق مەلا ابراهیم مەلا عبداللە)یە لەساڵی ١٩٤٣ لەگوندی (خەتێ) لەدایك بوون لەساڵی (١٩٦٨) بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرتووە مجازی مامۆستا مەلا محمد مەلا قادر هەرتەلییە.

3- یەکێکە لەوانەی یارمەتی مزگەوت و حوجرە بە بەردەوامی دەدەن.

4- ئـەم زاتـە، پارچـە زەوییەکـی لەتەنیـشت مزگـەوت کـڕی و بەشـێکی دایـە دەم پانتـایی مزگەوت و بەشێکیشی چەند دوکانێکی لێ دروست کرد، لەکرێی ئەو دوکانانە، تەواوی پێداویستیەکانی مزگەوت و حوجرە دابین دەکرێ.

لەتەدرس داوە، بەهەوڵ و تەقەلآی ئەم دوو زانایە، دەیان مامۆستای ئاییني قۆناغەکاني خوێندنیان لەم حوجرەیە تەواوکرد، لەوانە:

**وەجبەی یەکەم:**

١- مامۆستا مەلا یونس پیرداود باویاني

٢- مامۆستا مەلا احمد شێخ عبدالله وەرتێ

**وەجبەی دووەم:**

١- مامۆستا مەلا ابراهیم حکیم شواني (کارێزەیی) خاڵخالآني

٢- مامۆستا مەلا طاهر حاجي باپیر وەرتێ

**وەجبەی سێیەم:**

١- مامۆستا مەلا عبدالجبار شێخ ئۆمەر خەلیفاني

٢- مامۆستا مەلا صباح علي

**وەجبەی چوارەم:**

١- مامۆستا مەلا عبدالمقتدر سلیمان تالینان

٢- مامۆستا مەلا محمود علي هەرکي

سەرەڕای ئەو زاتانە، (٥) کەس لەفەقێیاني ئەم حوجرەیە، کۆتاییان بەخوێندن هێناوەو چاوەڕواني هەل و مەرجي لەباران بۆ ئاهەنگي دەرچوون ئەمەش ناوەکانیانە:

١- مامۆستا مەلا ابراهیم مەلا عبدالباقي هەرتەلی

٢- مامۆستا مەلا شمس الدین مەلا خالد وەرتێ

٣- مامۆستا مەلا عبد الأمیر حمد بیراوەیي

٤- مامۆستا مەلا عبدالرحمن مەلا صادق خەتێ (کوڕی مامۆستا)

٥- مامۆستا مەلا یوسف عزیز گەنجاني

لەم حوجرەیەش وەکو سەرجەم حوجرەکاني فەقێیان، کاتي بڕوانامە دابەشکردن ڕێورەسمي تایبەتي خۆی هەیە.

لەسەرەتاوە، ئاهەنگێکي خنجیلانە ساز دەکرێ و دەیان کەسایەتي لەزانا

ناودارو پیاو ماقولْ و ردێن سپی و نوێنەری لایەنە پەیوەندی دارەکان ئامادە دەبن وێرای کەس و کاری فەقێیەکان، پاش تەواوکردنی برگەکانی ئەم ئاهەنگە، لەووتارو سرودو بەزم و رەزمی وەها بۆ نەیەك، دەست بەدابەشکردنی بڕوانامەکان دەکرێ‌و دەرچوونی ئەو زانایانە بەخەڵکی رادەگەیندرێ.

ئەمەش ناوی ئەو فەقێیانەیە کەئێستاکە لەم حوجرەیەن

١- مەلا سیف الله عثمان خەتێ

٢- مەلا ابراهیم علی مصطفی خەتێ

٣- مەلا یاسین محمد خۆرانی

٤- مەلا عبدالجلیل ابراهیم بیرئاوەیی

٥- مەلا حمزە احمد حمەرەش شوانی/ کەرکووکی

هەندێ وردە زانیاری لەبارەی حوجرەکەوە)

* حوجرەکە لە (٢) ژوورو چێشتخانەیەك پێکهاتووە، سەرەڕای سەرشۆرو ئاودەست.

* تەواوی سەرچاوەکانی خوێندن، مامۆستاو فەقێیەکان دابینی دەکەن.

* وەکو زۆربەی حوجرەکان، هەفتەی (٥) رۆژ دەرسیان هەیە.

* خوێندن و دەرس وەرگرتنیان لەژوری (ئیمام و خەتیب)ی مزگەوتە.

* وێرای خوێندنەوەی بابەتی پێشوو تاوتوێ کردنی، رۆژی (٢- ٣) دەرسیان هەیە.

ئەمە بوو کورتەیەك دەربارەی رەوشی خوێندن لەم حوجرەیە.

چوارشەممە ٢٠٠٦/٩/١٣

**سەرچاوەکان:**


١- سەردانی مامۆستا مەلا صادق خەتی لەماڵەوە

٢- سەردانی حوجرەو فەقێیەکان لەنزیکەوە

٣- کتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی هەولێر) نووسینی (بەندە)و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف (هەولێر- ٢٠٠١).

# حوجرەی گەردی



ئـــــەم حوجرەیـــە ســـەر بـــە مزگـــەوتی (شـــەهید صـــباح)[1]ە لـە گـەڕەکی شـۆڕش لـە شـــاری هەولێر، سەرەتای دامەزراندنی بۆ ساڵی (١٩٩٤) دەگەڕێتەوە، کاتێ مامۆستا مەلا (رشید گەردی)[2] هاتە ئەم مزگەوتە، هەستا بەکردنەوەی حوجرەکەو ناوی (حوجرەی گەردی) لێنا، لەسەرەتاوە خۆیو جەنابی مامۆستا مەلا (انور گەردی) تەواوی ئەرکی بەڕێوەبردنی حوجرەکەیان لەئەستۆ گرت، نزیکەی

1- بۆ زیاتر شارەزابوون، بڕوانە لاپەڕە (١٩٤) لەکتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی هەولێر) نووسینی بەندەو بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف

2- ناوی تەواوی (شێخ عبد الرشید شێخ حاجی کوردو شێخ رشید ئاغایە) بەرگەز گەردیەو خۆی بەنەوەی حەزرەتی ئیمام حسن کوڕی حەزرەتی فاطمة دادەناو، لەدایك بووی ساڵی (١٩٦٧) و لەساڵی (١٩٩٢) لەسەرێکەوە کۆلێژی شەریعەتی (الامام الاعظم)ی تەواوکرد لەبەغداو لەسەرێکەوە بڕوانامەی مەلایەتی لەخوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبدالکریم مدرس وەرگرت، لەساڵی (١٩٩٤)وە تاکو (٢٠٠٥) لەمزگەوتی شەهید صباح (مدرس و خەتیب و ئیمام) بوو.

(١٠) ساڵ زیاتر حوجرەکە/ ئەم مزگەوتە بەردەوام بوو، پاشان گواستیەوە شارۆچکەی بەحرکە[1].

## هەندێ زانیاری تایبەتی لەبارەی حوجرەکەوە

* حوجرەکە لە (٣) ژور پێکدەهات، لەم (٣) ژورە فەقێیان دەرس و دەورو حەوانەوەیان بەسەر دەبرد.

* تەواوی ئەرکی دابین کردنی پێداویستیەکانی ئەم حوجرەیەو فەقێیانی لەئەستۆی هۆزی (گەرد)یان بوو.

* لەهەموو کاتێك لەم حوجرەیە ژمارەی فەقێیان لە (١٠- ١٥) کەس بوونە، هەبووە فەقێی قۆناغی دووا مادە بووە.

* هەر شەش مانگ جارێك لەم حوجرەیە، تاقیکردنەوەی فەقێیان کراوە.

* تەواوی کتێب و سەرچاوەکانی خوێندن لەم حوجرەیە لەو برە ئابوونەوەیە دابین کراوە کەهۆزی (گەردی)یان بەم حوجرەیەی دەبەخشی.

* مانگانە، تەواوی فەقێیەکان وەکو یارمەتی برە پارەیەکی دیاریکراویان لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافەوە هەیە کە دەگاتە (١٥٠٠٠) پانزە هەزار دیناری چاپی نوێ.

لەماوەی ئەم چەند ساڵە، بەهەوڵ و تەقەلاّی مامۆستا مەلا (عبدالرشید گەردیو مامۆستا مەلا انور گەردی)، دەیان کەس خوێندنیان لەم حوجرەیە تەواوکردو لەسەر دەستی مامۆستا مەلا رشید گەردی بڕوانامەی مەلایەتیان پێ خەلاّت کرا. لەوانە:

١- مامۆستا مەلا سەید محمد سەید خلیل هەولێری

---

1- لە ٢٠٠٥/١١/١ ئەم حوجرەیە گواستیەوە بۆ مزگەوتە نوێیەکەی مامۆستا مەلا عبدالرشید گەردی لەشارۆچکەی بەحرکە لەدەڤەری بەڕانەتی.

٢- ماموٚستا مەلا پشتیوان هەولێری

٣- ماموٚستا مەلا سیروان خەیلانی

٤- ماموٚستا مەلا کامران مامك خەیلانی

٥- ماموٚستا مەلا رێباز سەید احمد خەیلانی

٦- ماموٚستا مەلا محمد احمد خان خەیلانی

٧- ماموٚستا مەلا هوٚگر جوهر گەردی

٨- ماموٚستا مەلا موسی عبدالرحمن کەنداری

٩- ماموٚستا مەلا سەید عبدالله سەید فتح الله بەرزنجی

١٠- ماموٚستا مەلا سەید صفا سەید قاسم نعیمی

١١- ماموٚستا مەلا دەشتی قاسم ماستاوەیی

١٢- ماموٚستا مەلا کارزان فیصل حسن مامزئاوەیی

١٣- ماموٚستا مەلا مهداوی اسماعیل هورمزیار

١٤- ماموٚستا مەلا ابوبکر توفیق گلیجاڵی

١٥- ماموٚستا مەلا عثمان حسین مەزوری

١٦- ماموٚستا مەلا چەتوٚ ابوبکر احمد.

سەرەڕای ئەو زاتانەی کە ئاماژەمان بوٚ ناوەکانیان کرد، تاکو ئەمڕوٚش بەدەیان فەقێ لەو حوجرەیە لە شاروٚچکەی بەحرکە دەخوێنن سەرەڕای گواستنەوەی بوٚ بەحرکە، لەوانە:

١- مەلا عزیز سورچی، ٢- مەلا ارسلان سورچی، ٣- مەلا فارس سورچی، ٤- مەلا ابوبکر خەیلانی، ٥- مەلا رضوان هەریری، ٦- مەلا محمد گاینجی، ٧- مەلا خالد گەردی، ٨- مەلا سوٚران هەنارەیی، ٩- مەلا عبدالصمد شێخانی، ١٠- مەلا قهار محمد، ١١- مەلا عبدالله شێروانی، ١٢- مەلا هوٚگر اسماعیل حمد، ١٣- مەلا محمد صادق فقی رحمن، ١٤- مەلا عبدالفتاح قاسم، ١٥- مەلا بلال عبدالله، ١٦- مەلا پشتیوان قەراجی، ١٧- مەلا عبدالأله

هـەولێری، ١٨- مـەلا عبـدالله اسـعد، ١٩- مـەلا نجیـب عبدالـصمد، ٢٠- مـەلا عبدالرحمن قاسم علی.

ئەمە بوو کورتەیەك لەمێژووی ئەم حوجرەیە.

پێنج شەممەد
٢٠٠٦/١٢/٢١

سەرچاوەکان:

١- راپۆرتە دەست نووسەکەی مامۆستا مەلا عبدالرشید گەردی.

٢- کتێبـی (گەشـتێك بـەناو مزگـەوت و تەکیـەکانی هـەولێر) نووسـینی (بەنـدە)و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف (هەولێر- ٢٠٠١).

# حوجرەی مزگەوت و تەکیەی بەرزنجی[1]



ئەم حوجرەیە سەر بە مزگــەوت و تەکیــەی نــاوبراوە لەگــەڕەکی رزگــاری لەهــەولێر سـەرەتای دامەزرانـدنی بـۆ رۆژی (١٩٩٩/٢/٨) دەگەڕێتـەوە کـاتێ کـە مامۆسـتا مـەلا لقمـان[2] بەئیمام و خەتیب لەو مزگەوتـە دامـەزرا، بەهـەوڵ و تەقەلای ئەوو جەنابی کاك شێخ قادری شێخ محمد بەرزنجی و مامۆستا مەلا حسن حسین حوێز حوجرە بۆ فەقێیان لەو مزگەوتە کرایەوە.

هـەر لەیەکـەم رۆژەوە، دەیـان فـەقێی لـەخۆ گـرت و دەسـت بـە خوێنـدن کـرا، نزیکەی حەوت ساڵ، ئەم حوجرەیە بەردەوام بوو، تـاکو لەکۆتایی مـانگی ئـابی سـاڵی (٢٠٠٦) مامۆسـتا مـەلا لقمـان خـۆی نـەقلی مزگـەوتی مامۆسـتا مـەلا (عبـدالکریم مـدرس)[3] کـرد حوجرەکـە بەناچـاری داخـراو تـەواوی فەقێیـەکان

1- بۆ زیاتر شارەزابوون لەمێژووی ئەم مزگەوتە بڕوانە لاپەڕە (٢٦٠) لەکتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوتەکانی هەولێر) نووسینی (نەبەد) و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقافی هەرێمی کوردستان هەولێر (٢٠٠١).

2- ئەم زاتە بەرەگەز (گۆران)ە و لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٩)یە و مجازی مامۆستا مەلا ابوبکرە لەئاسکی کەلەك (خەبات). هاوکات خاوەن بڕوانامەی بکالۆریۆسە ئەندازیاری زانکۆی موصل و دەرچووی کۆلێژی شەریعەتی ئیسلامییە لەدهۆك و بەغداو خاوەن بڕوانامەی ماجستێرە لەشەریعەت هەر لەبەغدا.

3- ئەم مزگەوتە، لەنوێی دادەمەزرێ و کەوتۆتە گەڕەکی زانکۆی نوێ، نزیك گەڕەکی (٩٤).

رویان لەحوجرەکانی تری ناو شارکرد. سەرەڕای مامۆستا مەلا لقمان، ئەرکی ئەو حوجرەیە لەڕووی تەدریسەوە لەئەستۆی چەندین مەلای دی بوو، لەوانە:

١- مامۆستا مەلا هۆشیار اسماعیل مصطفی

٢- مامۆستا مەلا بلال علی محمد صالح

٣- مامۆستا مەلا مولود خضر محمد

٤- مامۆستا مەلا نورالدین جمیل عبدالقادر

٥- مامۆستا مەلا محمود محمد علی امین

٦- مامۆستا مەلا جمال حسین محمد

٧- مامۆستا مەلا عصام علی عبدالله

شان بەشان ئەم زاتانە، (مامۆستا مەلا حسن حسین حوین)یش وەکو سەرپەرشتکاری حوجرەکە بەشی زۆری کاروبارەکانی لەئەستۆ گرد.

لەو فەقێیانەی کە لەم حوجرەیە کۆتاییان بەخوێندن هێناو بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی زانستیە ئاینیەکان روویان لەزانایانی ناوشاری هەولێر کرد.

١- مامۆستا مەلا شاکر محمود محمد

٢- مامۆستا مەلا زانا عبدالکریم

٣- مامۆستا مەلا کیفی عمر عزیز

٤- مامۆستا مەلا هەڤال صدری صابر

٥- مامۆستا مەلا فتاح عبدالله رشید

٦- مامۆستا مەلا علی حمید علی عمر

٧- مامۆستا مەلا مریوان حسین حسن

٨- مامۆستا مەلا اکرم کاکل میرا

٩- مامۆستا مەلا حمزة عجیل حسن

١٠- مامۆستا مەلا دلیر عبدالله احمد.

خوێندنی فەقێیەکانی ئەم حوجرەیە، لەهەر (٣) قۆناغ دا هەبوو

ا- قۆناغی سوختەیی

ب- قۆناغی موستەعیدی

ج- قۆناغی دوا مادەکان

دابین کردنی پێداویستیەکانی حوجرە، لەسەر خێرخوازانی ئەو دەوروبەرە بوو بەتایبەت:

ا- کاك محمد نانەوا، نانی فەقێیەکانی لەئەستۆ گرتبوو

ب- خوشکە نزار خان، خێزانی کاك شێخ قادر شێخ محمد خاوەن مزگەوت.

جگە لەمانەش، دەیان کەس یارمەتی ئەم حوجرەیەی بە بەردەوامی دەدا.

## هەندێ چالاکی ئەم حوجرەیە

سەرەڕای بابەتەکانی خوێندنی ئاینی، فەقییەکان چەندین چالاکی تریان هەبوو، لەوانە:

١- سەردانی کەس و کاری فەقێیەکان بەکۆمەل لەهەر گویێ بووبن

٢- دامەزراندنی تیپێکی تۆپی پێ ناو بەناو چالاکیان لەگەلێ تیپەکانی تردا دەنوواند

٣- پێکهێنانی حەلقەیەك بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز لەماوەیەکی دیاری کراویش، ئەم دوو زاتە تەواوی قورئانیان لەبەرکرد.

ا- مەلا مریوان حسین حسن

ب- مەلا نهاد کریم عبدالرحمن

٤- پێکهێنانی تیپێکی سروود خوێدن وەکو سروودە ئاینیەکان و لەبۆنە پیرۆزەکان

٥- کارکردن بۆ فێربوون و راهێنانی فەقێیەکان لەبواری ووتار خوێندن و قورئان خوێندن و بانگدان

لەو فەقێیانەی کە لەم حوجرەیە بوون:

١- مەلا معروف نادر معروف

٢- مەلا ئازاد انور عثمان

٣- مەلا ئومید محمد کریم

٤- مەلا زبیر نادر رشید
٥- مەلا سامان جمال اسماعیل
٦- مەلا سامان جمال محمد
٧- مەلا زریان جلال محمد
٨- مەلا یعقوب عمر یاسین
٩- مەلا فەرهەنگ محمد مولود
١٠- مەلا هوزان احمد رشید
١١- مەلا ئاشتی ستار محمد
١٢- مەلا نهاد کریم عبدالرحمن
١٣- مەلا فرحو صالح محمد امین
١٤- مەلا رعد لقمان بهجت
١٥- مەلا نایف جمال محمد شریف
١٦- مەلا رفتار خضر عبدالله
١٧- مەلا زیاد طارق رمضان
١٨- مەلا جمال حمزة عزیز
١٩- مەلا ئارام سعدی کریم
٢٠- مەلا محمد جعفر رحمان
٢١- مەلا سەرکەوت عبدالرحمن احمد
٢٢- مەلا ادریس حسن محمد
٢٣- مەلا سەربەست نادر عبدول
٢٤- مەلا چیا مهدی حمه صالح
٢٥- مەلا ارکان سلیمان کریم
٢٦- مەلا مصطفى عبدالله صالح
٢٧- مەلا طه صابر حسن
٢٨- مەلا رضوان علی مصطفى

٢٩- مەلا مصطفى خضر محمد

٣٠- مەلا رمضان حازم امين

٣١- مەلا محمد عبدالرحمن احمد

٣٢- مەلا كارزان ظاهر فقى محمد

٣٣- مەلا حامد اسماعيل تمو

٣٤- مەلا بختيار شكر حمە امين.

ئەمە بوو كورتەيەك لەمێژووی ئەو حوجرەيەی كەمامۆستا مەلا لقمان محمد علی صالح دايمەزراندو ماوەيەكی زۆر بەڕێوەی برد.

**سەرچاوەكان:**

١- سەردانی حوجرەكە لەنزيكەوە

٢- ديدەنی ئەم بەڕێزانە

أ- مامۆستا مەلا لقمان محمد علی- ئيمام ووتار خوێنی پێشووی مزگەوتی بەرزنجی

ب- كاك شێخ قادر شێخ محمد- خاوەن مزگەوت

ج- مامۆستا مەلا حسن حوێز- ئيمام لەهەمان مزگەوت

٣- راپۆرتە دەست نووسەكەی مامۆستا مەلا لقمان لەمەڕ ئەو حوجرەيە.

٤- كتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەكيەكانی هەولێر) نووسينی (بەندە)و بلأوكراوەی وەزارەتی ئەوقاف هەرێمی كوردستان ٢٠٠١.

٥- چەند وێنەيەكی فۆتۆگرافی سەر بەحوجرە.

# حوجرەی مزگەوتی
# باقلان[1]

ئەم حوجرەیە سەر بەمزگەوتی ناوبراو بوو، لەگەڕەکی برایەتی لەهەولێر. سەرەتای کردنەوەی بۆ ڕۆژی (١/١/٢٠٠٠) دەگەڕێتەوە لەسەرەتاوە، بەهەوڵ و تەقەلاّی جەنابی (شێخ عبیداللـەی باقلان)[2] و مامۆستا (مەلا سەید هاشم سەید جمال)[3] کرایەوە تەواوی حوجرەکە لەدوو ژوری مامناوەندی پێکهاتبوو، بەردەوام ژمارەی فەقێیەکانی نزیك (٨) کەس بوون، ئەمەش ناوی هەندێ لەفەقێیەکانیەتی.



١- مەلا علی حسین عبدالقادر

---

1- بۆ زیاتر شارەزابوون، بڕوانە لاپەڕە (٣٠٨) لەکتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی ناوشاری هەولێر) نووسینی (بەندە)و بلاّوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف (هەولێر-٢٠٠١).

2- ئەم زاتە کوڕی شێخ حسن شێخ احمد باقلانەو بەرەگەز خۆی بەسەیدی بەرزنجە دادەناو لەدایك بووی ساڵی ١٩٣٣و خاوەنی مزگەوتەکەیە.

3- ئەم زاتە لەدایك بووی ساڵی (١٩٧٩)و مجازی مامۆستا مەلا عبدالقادر رسول بەحرکەییەو، دەرچووی پەیمانگای (ووتارخوێنیە) لەمزگەوتی سەواف، سەر بەوەزارەتی ئەوقاف.

٢- مەلا یوسف جلال رحمن

٣- مەلا ئاوارە علی مصطفی

٤- مەلا دلێر شریف عباس

٥- مەلا فلاح عثمان ابراهیم

بەشی زۆری فەقێیەکانی ئەم حوجرەیە تازە دەست پێکردوو بوون، جەنابی مامۆستا مەلا سەید هاشم، وێڕای ئیمام و خەتیبی مزگەوت ئەرکی تەدریسی لەئەستۆ گرتبوو لەماوەی ئەم (٥) ساڵە، دەیان فەقێ بۆ خوێندنی دەرس هانایان بۆ ئەم زاتە هێناوە. بەداخەوە لەسەرەتای ساڵی (٢٠٠٦) لەبەر چەند هۆیەك، ڕەوشی خوێندن لەم حوجرەیە وەستاو فەقێیەکانی هەر یەك بەلایکدا پەڕاگەندە بوون، تەواوی ئەرکی فەقێیانی ئەم حوجرەیە لەماوەی ئەم چەند ساڵە لەئەستۆی جەنابی شێخ عبداللە و هەندێ خێرخوازی دەوروبەری مزگەوتەکە بوو.

## هەندێ هۆکاری نەمانی خوێندن لەم حوجرەیە

کۆمەڵێك خاڵی هەمە جۆر هەن کەبوونەتە، هۆکارێك بۆ لەکورتی دانی خوێندنی ئاینی، نەك بەتەنها لەم حوجرەیە، بگرە شاڵاوی بۆ حوجرەکانی تریش بردووە. لەوانە:

١- نەبوونی دەزگایەکی بەرپرسی ڕاستەوخۆ لەبەڕێوەبردنی کاروباری حوجرەکان و دابین کردنی کەم و کورتیەکانیان.

٢- نەبوونی سستەمێکی دیاری کراو بۆ پەیڕەوکردنی لەهەموو ڕویەکەوە لەحوجرە.

٣- بایەخ نەدان بەماندووبوونی ئەو زانایانەی کەئەرکی تەدریس لەئەستۆ دەگرن و بەرز نرخاندنی ماندوبوونیان.

٤- کـەمی یارمـەتی و کۆمـەك کردنـی دارایـی فەقێیـەکان، چ لەسـەردەمی خوێندنیان، چ پاش تەواوکردن و بڕوانامە وەرگرتن.

٥- کەم تەرخـەمی هەنـدێ لـەزانایانی مزگەوتـەکان و خـەم نـەخواردنیان بـۆ پەرەپێدان بەم هەنگاوەو بەرەو پێرەو چوونیان.

٦- کەمی بایەخ دان بەبڕوانامەی ئەم حوجرانە، پاش تەواو کردنی خوێندن. ئەمانـەو دەیـان خـاڵی دیٚ هـەن، کـە لـەم کتێبـە ئاماژەمـان بـۆ هەنـدێکیان کردووە، بوونەتە ڕێگرو ئاستەنگ لەڕێگای پەرەپێدان بەم حوجرانە.

ئەمە بوو کورتەیەك دەربارەی ئەم حوجرەیەی ئەم مزگەوتە.

٢٠٠٦/٦/٦

## سەرچاوەکان


١- سەردانی حوجرەکە لەنزیکەوە

٢- سـەردان و دیـدەنی مامۆسـتا مـەلا سـەید هاشـم سـەید جمـال، ئیمـاو خـەتیبی مزگەوت و موەدریسی حوجرە.

٣- کتێبـی (گەشـتێك بـەناو مزگـەوت و تەکیـەکانی نـاو شـاری هـەولێر) نووسـینی (بەندە)و بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف (هەولێر- ٢٠٠١).

# ( حوجرەی پیر خدری شاهۆ )



ئەم حوجرەیە سەر بەمزگەوتی ئیمام علی یە لەسەر شەقامی (١٠٠) مەتری نزیك گەڕەکی باداوە. سەرەتای دامەزراندنی بۆ سەرەتای مانگی ئاداری ساڵی (٢٠٠٦) دەگەڕێتەوە کاتێ کە (سەید حسن پۆریجەیی) ئەم مزگەوتەی دروست کرد بەر لەکردنەوەی بڕیاری کردنەوەی حوجرەی فەقێیانی دا.

یەکەم مامۆستا ئەم حوجرەیەش مامۆستا مەلا (ممدوح مزوری)[1] بوو لەو ڕۆژەوە، دەیان فەقێی لەئامێز گرتووەو ڕۆژانە بەشە دەرسی خۆیان هەیە

1- ئەم زاتە لەدایکبووی ساڵی (١٩٢٨)و لەساڵی (١٩٥٦)وە خوێندنی مەلایەتی تەواوکردووەو هەڵگری بڕوانامەی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا اسعد مەلا عمر ئەفەندی خەیلانیە بۆ زیاتر شارەزابوون. سەیری تەواوی دەقی ژیاننامەی ئەم زاتە، لە دووتوێی

لەكاتی سەردانی ئەم حوجرەیە لەرۆژی یەك شەممە رێكەوتی ٢٠٠٦/٤/٢ بەرامبەر بە (٤/ صفر/ ١٤٢٧) بەچاو، چوار پێنج لەفەقێیان بۆ دەرس خوێندن دەورەیان لەجەنابی مامۆستا مەلا ممدوح دابوو. حوجرەی ئەم مزگەوتە، لەیەك دوو ژور پێكدێ و شەش حەوت فەقێیەكی لەخۆ گرتووە. لەوانە:

١- مەلا ئومید دەسكۆ حمە شریف مەلا كوردو سلیم

٢- مەلا عبدالباقی، خەڵكی كوردستانی توركیایە

٣- مەلا عماد ابراهیم یحیی

٤- مەلا هێمن هۆشنگ حمد

ئەمە بوو، چەند دێڕێك لەبارەی حوجرەی (پیر خدری شاهۆ) لەمزگەوتی (ئیمام علی بن ابی طالب) لەشاری هەولێر.

یەكشەممە

٢٠٠٦/٤/٢

٤/صفر/ ١٤٢٧

**سەرچاوەكان:**

١- سەردانی ئەم حوجرەیە لەرۆژی دیاری كراو لەنزیكەوە.

٢- سەردان و دیدەنی مامۆستا مەلا ممدوح لەكاتی دەرس ووتنەوە لە حوجرەی مزگەوتەكە.

---

ئەم كتێبە بكە، لەمانگی (٢٠٠٦/٣)وە هاتۆتە ئەم مزگەوتەو لەوەپێش لەمزگەوتی حاجی جمال بەزاز بوو.

# بەشی سێیەم

بۆ پڕکردنەوەی ئەم بەشە، وامان بەباش زانی بەژیاننامەی چەند زانایەکی کۆچ کردووی ئەم شارە، دەقی ئەم کتێبە لەوە زیاتر بڕازێنینەوەو سەرنجی خوێندەواری لەوە زیاتر پێڕابکێشین.

## خوالێخۆشبوو (مامۆستا مەلا فەندی)



ناوی تەواوی:

مەلا ابوبکر کوڕی مەلا عمر کوڕی مەلا ابوبکری سێیەم کوڕی مەلا عثمان کوڕی مەلا ابوبکری دووەم کوڕی مەلا عمر کوڕی مەلا ابوبکری یەکەم بوو.

ئەم زانایە بە (مەلافەندی) ناوبانگی دەرکردبوو لەساڵی (١٨٦١) لەبنەماڵەیەکی زانستی لەدایك بوو تەواوی خوێندنی هەر لەم شارە تەواوکرد، لەساڵی (١٨٩٠) کۆتایی بەخوێندن هێناو لەسەر دەستی رحمەتی باوکی بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرت. ماوەیەك لەمزگەوتی گەورەی سەر قەڵاو مزگەوتی گوندی (بادەوە) ژیانی بەسەر بردوو خزمەتی ئاینی پەروەردەو جۆرێك کرد. تاکە زانا بوو لەبواری دەرسە زانستییەکان، بەتایبەت (فەلەکیات) دەیان فەقێی وڵاتانی دراوسێی هەبوو، لە خەڵکی ئێران و تورکیاو سوریاو خۆرئاواو ناوەڕاستی عێراق. هەموو بۆ خوێندنی ئەم بابەتە، دەهاتنە لای مەلا فەندی و زۆربەیان بڕوانامەی ئەم

زاتەیان هەیە. ئەم زاتە کەسایەتییێك بوو، زۆر لەوە زیاتر کە لەدوو توێی یەك دوولاپەڕە لەبارەیەوە بدوێین، بەڵکو شایانی ئەوەیە کتێبی گەورەی لەسەر بنووسرێ لەژیانیدا.

توانیویەتی بڕوانامەی مەلایەتی بەزیاتر لە (٩٠)[1] کەس بدات.

پاش تەمەنێکی زیاتر لە (٧٠) ساڵ، لەرۆژی ١٩٤٢/١٢/٣١ کۆچی دوایی کردو تەرمەکەشی لەگۆڕستانی (باداوە) بەخاك سپاردرا.

ئەمە بوو بە کورتی چەند دێڕێك لەژیاننامەی ئەم زانا ناودارەی کورد.

چوارشەممە

٢٠٠٦/١١/١٥

**سەرچاوەکان:**

١- کتێبی (علماء ومدارس في اربیل) مامۆستا زبیر بلال اسماعیل ١٩٨٤

٢- کتێبی تاریخ جامع الکبیر في القلعة- عثمان رشاد مفتي ١٩٩٩

٣- کتێبی (ژیاننامەی زانایان)- عمر شێخ لطیف بەرزنجی ٢٠٠٤

٤- کتێبی (گەشتێك لەناو مزگەوتەکان)- عمر شێخ لطیف بەرزنجی ٢٠٠١

---

1- بڕوانە لاپەڕە (١٢) لەکتێبی (کورتەیەك لەژیاننامەی زانا ئایینیەکانی هەولێر)- دانانی عمر شێخ لطیف بەرزنجی و بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف لە هەرێمی کوردستان- هەولێر- ٢٠٠٤.

## خوالێخۆشبوو ( ماموٚستا مەلا احمد رحیم بانەیی )

ناوی ئەم زاتە، مەلا احمد کوڕی صوفی عبدالرحیم کوڕی محمد) بوو. بەرەگەز، خۆی بەنەوەی (سەید محمد شابەدین) داناوە، ئەم زاتە خاوەن دوو نازناو بووە، (مەلا احمد بانەیی، مەلای رەشی چەغەمیرە) لەساڵی (١٣١٣-١٨٩٣) لەگوندی (باشبرد) لەدەڤەری شارۆچکەی پێنجوین لەدایك بوو بوو.

هەر بەمنداڵی دایك و باوکی کۆچی دواییان کردو ئەم زاتە بەهەتیوی گەورە بوو، لەسەر داخوازی خزم و کەس، لەکاتی خۆی بۆ خوێندن رەوانەی لای مەلای مزگەوتی گوندی خۆیان کرا.

لەو ماموٚستایانەی دەرسیان بەم زاتە ووتووە

١- خوالێخۆشبوو ماموٚستا مەلا عبدالله ولزی

٢- خوالێخۆشبوو ماموٚستا مەلا سەید محمدی جۆری

٣- خوالێخۆشبوو ماموٚستا مەلا محمدی جوانڕۆیی

٤- خوالێخۆشبوو ماموٚستا مەلا عبدالقادر مدرس- بیارە

٥- خوالێخۆشبوو ماموٚستا مەلا عبداللەی بسوی

پاش تەواوکردنی بابەتەکانی خوێندن، لەسەر دەستی ماموٚستا مەلا عبدالقادر مودریس- بیارە بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرت، پاش تەواوکردنی خوێندن، چەندین ناوچەی کرد لەوانە:

١- مەڵبەندی زانست لەبیارە

٢- خانەقای مەولانا خالد لەشاری سلێمانی

٣- گوندی گەلاڵە، ناوچەی پشدەر

٤- گوندی عەودالان لەناوچەی شاری کۆیێ

پاشان، هاتە شاری هەولێرو لەسەر دەستی خوالێخۆشبوو (مەلافەندی)یش بڕوانامەی خۆی وەرگرت، نزیکەی (٣٠) دانە ساڵ، لەسنووری شاری هەولێر مەلایەتی کرد.

١- (٣)ساڵ لەشارۆچکەی مەخموور

٢- (٢) ساڵ لە گوندی دێمەکار

٣- (٢٢) ساڵ لەگوندی چەغەمیرە

هەر بەهۆی زۆری مانەوەی بوو لەگوندی چەغەمیرە، بۆیە ناوی چەغەمیرەی پێوە لکاو بوو بەنازناوی، هەر لەساڵی (١٩٣٤ تاکو ١٩٥٦) لەوێ مایەوە، پاشان چووە گوندی مورتکەی گەورە.

پاش ساڵێك، لەساڵی (١٩٥٧) کۆچی دوایی کردو هەر لەگۆڕستانی گوندی ناوبراو بەخاك سپاردرا.

## ناوی هەندێ لەو زانایانەی لای ئەم زاتە خوێندویانە.

١- ماموٚستا مەلا حمدامین سوێری

٢- ماموٚستا مەلا عبدالله جروستانی

٣- ماموٚستا مەلا ابوبکر کۆیی (دووگرتکانی)

٤- ماموٚستا مەلا رشید موکریانی

٥- ماموٚستا مەلا خلیل دووسەرەیی- مخلص شاعیر

٦- ماموٚستا مەلا سەید توفیق بەرزنجی

٧- ماموٚستا مەلا ابوبکر شەرکانی

٨- ماموٚستا مەلا محمدی مەخمووری

٩- ماموٚستا مەلا عبدالقادر سۆر بەشی

١٠- ماموٚستا مەلا عبدالقادر ماجدی

١١- ماموٚستا مەلا علی عەودالآنی

١٢- ماموٚستا مەلا عبدالغفور مەلا ئاغا

١٣- ماموٚستا مەلا سعید حسین قوڵتەپەیی

١٤- -ماموٚستا مەلا عبدالکریم مدرس- بیارە

١٥- ماموٚستا مەلا سەید محمد سەید اسماعیل بەرزنجی

١٦- مامۆستا مەلا مصطفى بێلنگی- خۆشناو

١٧- مامۆستا مەلا عبدالفتاح مەخمووری

١٨- مامۆستا مەلا علی سەربەشاخی

١٩- مامۆستا مەلا احمد گۆمەکرۆ

٢٠-مامۆستا مەلا عمری تەرجانی- کەوور

٢١- مامۆستا مەلا احمد قەرەبەگی

٢٢- مامۆستا مەلا احمد گورزەیی

٢٣- مامۆستا مەلا حسین شەعل

٢٤- مامۆستا مەلا عمری چۆمە زەردەڵە.

ناوی مجازەکانی ئەم زاتە، لەم دەفەرە

١- مامۆستا مەلا قادر شێروانی

٢- مامۆستا مەلا سلیم دیبەگەیی

٣- مامۆستا مەلا قادری دێمەکار

٤- مامۆستا مەلا عمری شێروانی

٥- مامۆستا مەلا عمری چۆمە زەردەڵە.

ئەم زاتە، پشت بەتواناو لێهاتوویی خۆی، ناوبانگێکی زۆری لەم ناوچەیە دایەوە.

تێبینی: بەهۆی نەنووسینی ژیاننامەی ئەم زاتە، لەناو کتێبی (ژیاننامەی زانا کۆچ کردووەکان) تا رادەیەك لێرەدا بەدوورو درێژی نووسیمانەوە داوای لێبوردن دەکەم.

٢٠٠٦/١١/١٤

سەرچاوە:

دیدەنی مامۆستا (عزیز مەلای) کوڕی.

# خوالێخۆشبوو (مامۆستا مەلا عبداللەی عەوێنە)



ناوی (مەلا عبدالله کوڕی مەلا عثمان) بوو، لەناو خەڵکی بەمەلا عبداللـــەی عەوێنـــە ناوبـــانگی دەرچـــوو بـــوو، لەســـاڵی ١٩١٤ لەگونـــدی (ماجـــداوە)ی ســـەر بەناحیـــەی گـــوێڕ هـــاتبووە دونیاوە، هەرکە تەمەنی گەیشتە شەش حەوت ساڵان، ئارەزووی خوێندنی لەناخدا پەیدا دەبیّ و زۆر بەپەرۆشەوە دەست بەفەقێیاتی دەکات، دەیان زاناو گوندو مزگەوتی کرد، لەوانە:

١- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا قادر (واحد العین)

٢- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا علی بندیان

٣- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عثمان دوڵەزە

٤- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا محمد شێروانی

پاش ماندوبوونێکی زۆر توانی لەساڵی (١٩٥١) کۆتایی بەتەواوی کتێب و بابـەت و سەرچـاوەکانی خوێنـدن بهێنـیّ و لەسـەر دەسـتی خوالێخۆشـبوو مامۆستا مەلا عثمانی باوکی بڕوانامەی مەلایەتی وەرگریّ.

سەرەڕای ئیجازەکەی باوکی هانا دەباتە بەر خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا صالح کۆزەپانکە لەمزگەوت و تەکیەو حوجرەی شێخ نورالدین بریفکانی

لەگەڕەكی تەعجیل لەهەولێرو لای ئەو زاتەش دووەم بڕوانامەی مەلایەتی وەردەگرێ.

پاش بەمەلا بوونی، گەڕایەوە گوندی عەوێنەو دەستی بەمەلایەتی كرد. سەرەڕای مەلایەتی و كاروباری مزگەوت و خەڵكی گوند، دەیان فەقێ دەورەیان لێداو ڕۆژانە دەرسیان لا دەخوێند.

لەوانە:

١- مامۆستا مەلا عبدالرحمن ماستاوەیی

٢- خوالێخۆشبوو، مامۆستا مەلا جوهر هێلەوەیی

٣- مامۆستا مەلا صابر احمد سەڵتە

٤- مامۆستا مەلا جعفر حمد

٥- مامۆستا مەلا حسن مولود گوندی حسن بەگ

٦- مامۆستا مەلا عبداللەی گرد عازەبانی

٧- مامۆستا مەلا ابو بكر گرد عازەبانی

٨- مامۆستا مەلا سەید محمود

٩- مامۆستا مەلا عبدالله بەگ

١٠- مامۆستا مەلا احمد كەشكە

١١- مامۆستا مەلا محمود سورە

١٢- مامۆستا مەلا صدیق زەمزەمۆك

١٣- مامۆستا مەلا یاسین دهیماتی

١٤- مامۆستا مەلا محمد شێخ شەروانی

ئەم زاتە، بۆ ماوەی (٢٠) دانە ساڵ لەگوندی ناوبراو مەلایەتی كرد، بەهەموو جۆرێك و لەهەموو تەوەرێك خزمەتی ئاینی پیرۆزی كرد لەساڵی ١٩٨٧ لەسەردەمی وێرانكردنی گوندەكانی دەوروبەری هەولێر، مامۆستا بەناچاری هاتە هەولێرو لەمزگەوتی (صلاح الدین) بەئیمام دانراو ڕۆژانی

هەینیش بۆ ووتار خوێندنەوەی نوێژ، دەچووە مزگەوتی (رشاد نجار). دوو[4] قۆناغی ژیانی مەلایەتی، مزگەوتی (خدیجە الکبری) بوو.

پاش تەمەنێکی پتر لە (٩٠) ساڵی، لەشەوی ٨ لەسەر ٢٠٠٥/٥/٩ دووا هەناسەی داو ماڵئاوایی لەسەرجەم خزم و کەس و دۆستانی کرد.

بە بەشداریو ئامادەبوونی جەماوەرێکی زۆری ئەم شارەو بەشی زۆری زانایانی ئایینی، تەرمەکەی بەرەو دووا مەنزڵگا بەریٚ کرا.

بەم شێوەیە خەباتی ئەم کەڵە زانایەش لەگۆڕەپانی ژیان کۆتایی هات و لاپەڕەی ژیانی پێچرایەوە.

# ( ماموٚستا مەلا سەید محمد پیرداود )



**ناوی تەواوی:**

**(مەلا سەید محمد کوڕی سەید اسماعیل کوڕی سەید عمر کوڕی سەید امین کوڕی سەید احمد کوڕی سەید کریم کوڕی سەید احمد) بوو بەرەگەز، خوٚی لەنەوەی (پیر خدری شاهوٚ)[1] دادەنا. لەناو خەڵکی بە (ماموٚستا مەلا سەید محمد پیرداود)[2] ناویانگی دەرچووە.**

1- ئەم زاتە خوٚی دەڵێ (ئێمە نەوەی پیر خدری شاهوٚ)ین.

2- بەهوٚی ئەوەی ماوەیەکی زوٚر لەژیانی لەو گوندە، مەلایەتی کرد، بوٚیە ناویانگی بەو گوندە دەرچوو کەدەکەوێتە رێگای (مەخموور- هەولێر).

لەساڵی (١٩١٦) لەگوندی (قوڵتەپە)[1]ی سەر بەناحیەی (قوشتەپە)[2] لەدایکبوو، هەر بەمنداڵی، باوکی کۆچی دوایی کردووە، ئەم زاتە لەسایەی برایەکی گەورەی پەروەردە کراوە سەرەتای خوێندنی لای مامۆستا مەلا شریف هەر لەگوندی قولتەپە دەستی پێکردووە. لەماوەی خوێندنی دەیان زانا گوندی ئەو سەردەمەی کرد، لەوانە:

١- مامۆستا مەلا أبوبکر شەرکانی، لەحوجرەی مامۆستا مەلا سعید سیان
٢- مامۆستا مەلا عثمان بیرەعارەبانی لەگوندی (دۆلەزە)
٣- مامۆستا مەلا عبداللەی عەودالآنی لەشارۆچکەی کۆیە
٤- مامۆستا مەلا طاهر لەناوچەی بێتواتە
٥- مامۆستا مەلا مجید هەرتەلی، لەگوندی بێلینگە
٦- مامۆستا مەلا شێخ عبدالکریم بەرزنجی لەگوندی ئۆمەراوە
٧- مامۆستا مەلا عمر لەگوندی (خورمەڵە)
٨- مامۆستا مەلا شێخ معروف شێخ اسماعیل لەگوندی جلبەسەرە
٩- مامۆستا مەلا عمر تەلەخێمەیی لەگوندی (کتکە)
١٠- مامۆستا مەلا عثمان سیان لەگوندی دۆلەزە
١١- مامۆستا مەلا سعید ئاومالی لەگوندی بەردەسپی
١٢- مامۆستا مەلا اسماعیل (ناقص)[3] لەگوندی قەشقە
١٣- مامۆستا مەلا عمری رەش لەگوندی قەشقە
١٤- مامۆستا مەلا قادر (واحد العین) لەگوندی چۆمەزەردەڵە
١٥- مامۆستا مەلا شریف دووشیوانی لەگوندی گردەسۆر

---

1- قوڵتەپە لەوانەیە (قورتەپە)یە، ئەم ناوەش تورکییە بەکردۆلکەیەك دەوترێ بێ دارو درەخت و سەوزی بێ (کەواتە گردۆلکەی ووشك).

2- قوشتەپە- واتە گردۆلکەی پەلەوەر یان (گردی کۆتر).

3- ئەم زاتە بەر لەتەواوبوونی (٩) مانگی لەدایك بوو بوو، بۆیە (ناقص)یان پێوە لکاند.

١٦- ماموٚستا مەلا طيب دووشيوانی لەگوندی دێمەكار

١٧- ماموٚستا مەلا حمدامين سوێری لەكەسنەزان

١٨- ماموٚستا مەلا اسماعيل ديبەگەيی- لەديبەگە

١٩- ماموٚستا مەلا احمد رحيم بانەيی- مەلای رەشی چەغەميرە.

پاش مانەوەيەكی زوٚر لەخزمەت ماموٚستا مەلای رەشی چەغەميرە، بڕياری دا خوٚیو هەندێ لەفەقێيەكانی بچنە گوندی پيرداود ماوەيەكی زوٚر لەوێ مەلايەتی كردو دەرسی بەفەقێيان دا، پاشان دووبارە گەڕايەوە خزمەت ماموٚستا مەلا احمد رحيم بانەيیو كتێبەكانی تەواوكرد، لەوانە:

(مطول، عبدالحكيم، جمع الجوامع، كتێبە فەلەكياتەكان) پاش تەواوكردنی ئەم كتێبانە، بەرەو شاری هەولێر بەرێكەوت و چووە خزمەت ماموٚستا مەلا صالح كوٚزەپانكەو تەواوی دووا مادەكانی لای ئەو زاتە تەواوكرد، لەوانە:

١- كتێبی شرح الجغميني

٢- كتێبی ربع المقنطر

٣- كتێبی حاشية البرجندی

٤- كتێبەكانی بابەتی فەلەكيات.

هەر لای ئەم زاتە، لەساڵی (١٩٤٥) كوٚتايی بەخوێندن هێناو بڕوانامەی مەلايەتی وەرگرت. پاش تەواوكردنی خوێندن و بڕوانامە وەرگرتن، گەڕايەوە گوندی پيرداود بووە بەمەلا پاش نزيكەی (٢٢) ساڵ مانەوە لەوێ هاتە شاری هەولێرو بەمەلايەتی ئەم مزگەوتانەی لەهەولێر كرد.

١- مزگەوتی حاجی طه قصاب لەگەڕەكی سەعدون ئاوە

٢- مزگەوتی شێخ نورالدين بريفكانی لەگەڕەكی تەعجيل

٣- مزگەوتی (الفرقان) لەگەڕەكی راستی (حي العدل)

لەساڵانی دوو هەزار، ماموٚستا مزگەوتێكی لەگەڕەكی راستی دروست كرد لەروٚژی (٢٠٠٢/٤/٢٧) گواستيەوە مزگەوتەكەی خوٚی كە ناوی لێنا (مزگەوتی

سـەيد محمـد پـيرداود) لـەو كاتـەوە تـاكو نووسـينى ئـەم بابەتـە، ئـەو زاتـە لەمزگەوتەكەى خۆى سەرقاڵى كتێب خوێندنەوەو ميواندارى دۆستانە.

## مامۆستا مەلا سەيد محمدو دەرس ووتنەوە

ماوەيـەكى زۆر، ئـەم زاتـە سـەرقاڵى دەرس ووتنـەوە بـوو، بـەدەيان زانـاى ناودارى ئەم شارە، لاى ئەم زاتە فەقێ بوونە، لەوانە:

١- مامۆسـتا مـەلا عبـدالرحمن گـرد جوتيـار- ئيمـام و خـەتيبى ئێـستاى مزگەوتى (حاجى عزيز خەرابەدراوى) لەهەولێر

٢- خواليخۆشبوو، مامۆستا مەلا عبداللەى نەبياوەيى[1]

٣- خواليخۆشبوو، مەلا عمرى چۆمە زەردەڵە

٤- مامۆستا مەلا سعدالدين مەلا مسعود ئاشوكان

٥- مامۆستا مەلا محمد ئينەيى

٦- مامۆستا مەلا عزيزى رەژو كەريان

٧- مامۆستا مەلا شێخ احمدى خۆشكان

٨- مامۆستا مەلا احمد باوە

٩- مامۆستا مەلا عبدالغنى حاجى طە-ى حي العدل

## لەمجازەكانى ئەم زاتە:

١- خواليخۆشبوو مامۆستا مەلا عمرى چۆمە زەردەڵە

٢- مامۆستا مەلا على خدر مامك

٣- مامۆستا مەلا عبدالغنى حاجى طە- مزگەوتى (حي العدل)

---

1- ئـەم زاتـە، هاوڕێـەكى نزيكـى مامۆسـتا مـەلا عبـدالرحمن گردجوتيـار بـوو، هـەڵگرى بڕوانامەى زانكۆى (الازهر) بوو لەولاتى (مصر).

بـــەهۆی ئـــەو پەیوەندییـــە بەتینـــەی لـــەنێوان جـــەنابی شـــێخ مـــصطفی‌ی نقشبەندی‌و مامۆستاوە هـەبوو، مـەلا سـەید محمـد بوو بە یەکێ لـە موریـدانی ڕێبازی نەقشبەندی لەهەولێر. لەو زاتانەی کە لەژیانداماون و دۆستایەتی ئەم زاتەیان هەبوو.

١- مامۆستا مەلا سەید عبداللەی گردەسۆری

٢- مامۆستا مەلا عبداللەی فەرهادی

٣- مامۆستا مەلا علی بیرە عارەبان.

## مامۆستاو لایەنی نووسین

ئـەم زاتـە، سـەرەڕای تـەدریس و ئمامـەتی‌و وتـار خوێنـدن، دەیـان کتێبـی بەهەردوو زمان نووسیوەتەوە، هەندێ لەو کتێبانەی چاپ دراوە،

أ- کتێبە عەرەبیەکان

١- کتێبی (خدمة الدين واعانة الطالبين في اعادة الظهر وبراءة الذمة بيقين).

٢- کتێبی نخبة الافكار في تنجية والدى المختار (ص).

٣- کتێبی تحقيق المقام في نزاهة سيد الأنام.

٤- کتێبی فتاوى في حق زوجات المفقودين.

٥- کتێبی ظاهرة السنة والكتاب في حل ذبيحة أهل الكتاب.

٦- کتێبی (مشروعيه التلقين).

ب- کتێبە کوردییەکان

١- کتێبی رونکردنەوەی سەفەری حەج.

٢- کتێبی کورتە باسێك دەربارەی دوعای (القنوت).

٣- سەلەوات و سەلامی پاش بانگی نوێژەکان.

٤- خشتەی کاتەکانی نوێژم چۆن داناوە؟.

بەر لەوەفاتی، سەرقاڵی نووسینەوەی کتێبێکە بوو لەبارەی (حكم الموسیقی في الاسلام) ئەم کتێبە ئامادەیە بۆ لەچاپ دان.

ئەمە بوو کورتەیەك دەربارەی ژیانی ئەم زاتە.

٢٠٠٦/١٢/٤

**سەرچاوەکان**

١- سەردان و دیدەنی مامۆستا لەنزیکەوە لەرۆژی ئاماژە بۆ کراو.

٢- سەردان و دیدەنی مامۆستا مەلا عمری کوری- بەڕێوەبەری (الاموال القاصرین) لەهەولێر.

٣- راپۆرتە دەست نووسەکەی مامۆستا (عمر) لەمەڕ ژیانی باوکی.

# خوالێخۆشبوو ( ماموستا مەلا ابوبکر بێستانە )



ناوی تەواوی (مەلا ابوبکر کوڕی عبداللە کوڕی احمد) بوو بەرەگەز لەهۆزی (هورمزیار) بوو، لەناو خەڵکی بەمەلا ابوبکر بێستانە ناسرابوو لەساڵی ۱۹۲۰ لەگوندی (سووربەش)ی خدر لەسنووری ناحیەی (قوشتەپە) لەدایکبوو بوو، هەرکە تەمەنی گەیشتە شەش حەوت ساڵان، بەمەبەستی خوێندن خۆی گەیاندە گوندی (هەڵەجە) هانای بردە بەر ماموستا مەلا محمود سوربەشی.

پاش ماوەیەك چووە گوندی (البو صباح) لەدەڤەری پارێزگای کەرکووك.

پاش دەیان ساڵ خوێندن لای ئەم مەلاو ئەو مەلاو گوندو مزگەوت لەساڵی (۱۹٤۷) کۆتایی بەخوێندن هێناو ئیجازەی مەلایەتی لەمەدرەسەی مزگەوتی گەورەی قەلاّ وەرگرت[1].

لەساڵی ۱۹٤۸ لەمزگەوتی گوندی بێستانە دەستی بەمەلایەتی کردو کۆمەڵە فەقێیەکی هەبوو، لەوانە:

١- ماموستا مەلا طلحەی ئەندام پەرلەمانی کوردستان

٢- ماموستا مەلا عبدالرحمن هەمزە کۆری

٣- ماموستا مەلا عبدالرحمن رسول هەمزە کۆری

٤- ماموستا مەلا انور سەعاتچی.

لەساڵی ۱۹٦۳ هاتۆتە شاری هەولێرو ماوەیەك ئیمامی مزگەوتی (سەید محمود) بوو لەگەڕەکی عارەبان. هاوکات لەپەیمانگای ئایینی لەمزگەوتی گەورەی ناو بازاڕ کرایە ماموستای وانەبێژی. لەماموستا هاوڕێیەکانی

١- ماموستا مەلا عبداللە رسول ٢- ماموستا مەلا عبدالقادر گەردی

٣- ماموستا مەلا عبدالرحمن شێخ عبدالکریم بەرزنجی

---

1- ماموستا محسن کوڕی واینووسیووە.

لەساڵی ١٩٦٧، چۆتە گوندی (بەنەسلاوە)و تاکو ساڵی ١٩٨٢ بەئیمام و خەتیب لەوێ ماوەتەوە لەفەقێیەکانی ئەوێ

١- دکتۆر محمد قەرەنی کۆلێژی شەریعەت لەزانکۆی صلاح الدین لەهەولێر

٢- مامۆستا احمد محمد قەرەنی

٣- مامۆستا سراج ابو بکر عبداللەی کوڕی ماستەرەی لەفقه هەیە

٤- مەلا کانبی علی احمد- ونبووە

لەساڵی (١٩٨٢)وە گەڕایەوە ناو شارو لەمزگەوتی عثمان بن عفان (مەلا طلحە) بوو بەئیمام، پاش ساڵێك لە ١٩٨٣/٢/١ بە نەخۆشییەکی کوشندە وەفاتی کرد.

## چەند لایەنێك لەژیانی

ئەم زاتە، بەزۆری پەیوەندی هات و چۆی لەگەڵ ئەم بەڕێزانە هەبوو:

(مامۆستا مەلا فەندی، شێخ مصطفی نەقشبەندی، مەلا ابوبکری کۆیی، مەلا شێخ طاهر هەڵەبجە، مەلا محمدی کۆیی، مەلا علی کرۆ، کاکە خان، مەلا علی مەلا عبداللە، مەلا فائز مەلا عبداللە، سەید نوری سەید خەنجەر)

لە ١٩٥١/١١/٢٥ ئامۆزایەکی خۆی بەناوی (ناسکە قادر) بۆ هاوسەری دیاری کردووەو بۆتە خێزانی ئەم کوڕانەی لێ بووە

١- مامۆستا محسن- ١٩٥٣ مامۆستای قوتابخانەیە

٢- مامۆستا تحسین ١٩٥٤ فەرمانبەری میرییە

٣- مامۆستا سراج ١٩٥٥ هەڵگری بڕوانامەی ماسترە

لەساڵی ١٩٦٠ ژنی دووەمی بەناو (سلطانە حمد عبداللە) دەگوازێتەوەو تەنها یەك کوڕی بەناو (خلیل)ی لێبوو، کە لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٣)یە..

ئەمە بوو کورتەیەك لەژیاننامەی ئەم زاتە.

### سەرچاوەکان

١- سەردانی ئەم بەڕێزانە (مامۆستا مەلا طلحة، مامۆستا مەلا ابوبکر گردعازەبانی، مامۆستا مەلا انو سەعاتچی).

٢- راپۆرتەکەی مامۆستا محسن کوڕی.

# خوالێخۆشبوو (مامۆستا مەلا محمد کەور)



ناوی تەواوی (مەلا محمد کوڕی اسماعیل کوڕی حسن کوڕی حسین کوڕی احمد) بوو، لەناو خەڵکی بەمەلا محمدی کەورو (ابو صباح) بەناوبانگ بوو. بەرەگەز (شێخانی) بوو لە ١٩٢٥/٧/١ لەگوندی (کەور) لەبنەماڵەیەکی هەژار لەدایکبوو، هەرکە تەمەنی گەیشتە (٧- ٨) ساڵان، لەسەر خواستی حاجی اسماعیل باوکی بۆ فێربوونی خوێندەواری رەوانەی لای (مامۆستا مەلا ابراهیم کەپران) کرا جگە لەم زاتە، دەیان مامۆستای کرد، لەوانە:

١- مامۆستا مەلا صدیق

٢- مامۆستا مەلا عبدالرحمن

٣- مامۆستا مەلا یونس

٤- مامۆستا مەلا عبدالرحمن گعێتل

٥- مامۆستا مەلا احمد لەگوندی تەرجان

٦- مامۆستا مەلا حسین رشوانی

٧- مامۆستا مەلا محمد شیروانی لەگوندی (قەپلان)

٨- مامۆستا مەلا احمد حسین گردعازەبانی

پاش دەیان ساڵ خوێندن لای ئەم زانایانەو چەندین زانای تر دووا مادەکانی بردە لای خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا اسماعیل دیبەگەو لەساڵی (١٩٥٢) لەسەر دەستی ئەم زاتە بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرت.

لەهاوڕێیەکانی لەفەقێیاتی

١- مامۆستا مەلا قادر

٢- مامۆستا مەلا محمد شورجە

٣- مامۆستا مەلا عمری مەلا قەرەیی

٤- مامۆستا مەلا صابر مەلا اسماعیل دیبەگە

سەرەتای ژیانی مەلایەتی لەمزگەوتی گوندی گەڕەسوری (فرحان ئاغا)وە بوو، پاشان مزگەوتی گوندی عەلیاوە پاش شەش حەوت ساڵێك مەلایەتی، لەساڵی (١٩٥٩) ئەم زاتەش وەکو سەدان زانای ئەم وڵاتە، بەشداری خولی مامۆستایانی لەشاری موصل کردو لە (١٩٦٠/١١/١٧) بوو بە (معلم) سەرەتایی، پاش (٢٣) ساڵ خزمەتی قوتابخانەکان لەکوردستان لەساڵی (١٩٨٣) گەڕایەوە سەر مەلایەتی لەمزگەوتی (حاجی سلام) لەگەڕەکی مامۆستایان لەهەولێر ئەم جارەیان (٢٤) دانە ساڵ لەم مزگەوتە مایەوە، تاکو لەڕۆژی (٢٠٠٧/٧/٣١).

پاش تەمەنێکی پتر لە (٨٠) ساڵ کۆچی دوایی کردو لەخاکی گۆڕستانی شارەوانی باشوور (معمل قیر) بەخاك سپاردرا.

## هەندێ لایەنی ژیانی

* لەژیانی (٢) جار بەمەبەستی حەج سەردانی کەعبەی پیرۆزی کردبوو، (١٩٨١- ٢٠٠١).

* ئەندامی لقی یەکێتی زانایانی ئایینی بوو لەهەولێر.

* لەژیانی دا (٢) ژنی هێنابوو، یەکەمیان کچی (شێخ طاهر باقلانی)و دووەمیش کچی (حاجی محمود گەڕەسوری) قەراج بوو.

* لەم دوو ئافرەتە، ئەم کوڕانەی لەپاش بەجێماوە

١- کاك کامران

٢- كاك دلشاد

٣- كاك دلۆڤان

٤- كاك نريمان

لەدۆستە نزیكەكانی:

١- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا اسماعیل نانەكەلی

٢- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبدالرحمن شەمشولە

٣- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبدالحمید شەمشولە

٤- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عثمان كلاورەش

٥- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا حمید كۆیی

٦- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبدالرحمن خەرابە دراوی

ئەمە بوو گوڵبژێریەك لەژیاننامەی ئەم زاتە.

**سەرچاوە:**

راپۆرتە بەكۆمپیوتەر نووسراوەكەی كوڕەكانی.

# خوالێخۆشبوو (ماموستا مەلا جوهر هێلەوەیی)



ناوی تەواوی (مەلا جوهر کوڕی مولود کوڕی سعید) بوو لەناو خەڵکی بە (مەلا جوهر هێلەوەیی) ناسرابوو بەرەگەز لەهۆزی (ئورمزیار) بوو لەساڵی (١٩٣٤) لەگوندی هێلەوە لەدایکبوو بوو، سەرەتای خوێندنی لەمزگەوتی گوندی خۆیان دەستی پێکرد پاش دەیان زاناو مزگەوت و حوجرە، دووا مادەکانی بردە خزمەت خوالێخۆشبوو ماموستا مەلا ابوبکر کۆیی و لەگەڵ ئەم زاتانە، بڕوانامەی مەلایەتیان لەساڵی (١٩٥٦) وەرگرت.

١- ماموستا مەلا شێخ صمد

٢- ماموستا مەلا جعفر هێلەوەیی

٣- ماموستا مەلا احمد

سەرەتای ژیانی مەلایەتی لەگوندی (هەوارغەر)وە دەستی پێکردو پاش چەند مانگێك چووە مزگەوتی گوندی (ئۆمەرەسۆر) پاش یەك دوو ساڵ، لەساڵی (١٩٦٠) باری کردە گوندی قۆڕیتان و بوو بەمەلای مزگەوتی گوند.

(٩) دانە ساڵ لەوێ مەلایەتی کرد بەهەموو تەوەرەکانیەوە.

لەساڵی (١٩٦٩) لەسەر داخوازی حاجی بکر زیرنگر هاتە هەولێرو بوو بەئیمام و خەتیب و مودەریس لەمزگەوتی حاجی بکر زیرنگر.

(٣٧) ساڵ لەو مزگەوتە مەلایەتی کرد، تاکو لەرۆژی (١٤/٨/٢٠٠٦) کۆچی دوایی کرد.

## هەندێ لایەنی ژیانی

* مامۆستا وەکو زانایەکی سەردەمی خۆی، دەرسی بەدەیان زانای ئاینی داوە، لەفەقێیەکانی.

١- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبدالله گردعازەوبانی

٢- مامۆستا یوسف (بەڕێوەبەری گشتی) لەپەروەردەی شاری هەولێر.

٣- مامۆستا یاسین عمر- بەڕێوەبەری قوتابخانەی شەوانی کوران لەهەولێر

٤- مامۆستایان خەسرەو هاشم مەلا حمدامین دیبەگە.

* ئەم زاتە کەسایەتێك بوو لەژیانیدا زەکاتی وەرنەدەگرت، بەلاّم کاتێ زەکات لای کۆدەبۆوە دەچووە گرتوخانەکان و بەسەر بەندکراوەکاندا دابەشی دەکرد.

لەوانەی شایەد حاڵی ئەم کردەوەیەن:

ا- مامۆستا سعدی علی- بەرپرسی کۆمیتەی (٣)ی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

ب- مامۆستا ئازاد سعید مولود- بەرپرسی کۆمیتەی زیندانە سیاسیەکان.

* مامۆستا دۆستایەتییەکی تەواوی لەگەڵ زۆرینەی زاناو پیاو ماقوڵی سەردەمی خۆی هەبوو، لەسەروی هەموویانەوە خوالێخۆشبوو (جەنابی شێخ مصطفی نەقشبەندی) هەرشەمی.

* مامۆستا لەساڵی (١٩٥٧) لەگوندی (هەوارغەر) ئافرەتێکی بەناو (عاصمە سەید حمد) عەوێنەیی پەسەند کردو بوو بەهاوسەری ژیانی.

یەکەم کوڕی کەناوی (مامۆستا مسعود پەرێشانە) لەساڵی (١٩٥٨) لەدایکبوو.

- مامۆستاش وەکو زۆربەی مەلاکانی کوردستان خاوەن هەڵوێستی پاکی کوردایەتی بوو، تەوەر نەبوو راستەوخۆ لەخوتبەکانیدا باس لەکەم کورتیەکانی نەکات و لۆمەو گازاندەی ئاراستەی بەرپرسان نەکات، بەتایبەت لەسەردەمی رژێمی کۆن.

* لەژیانی، لەسالآنی (١٩٧٥) بەدوواوە، دووچاری نەخۆشی (شکرە) هات و (٣) جار لێیدا، جارێك لەچاوی و جاریّ لەئەژنۆی (چۆکی) جاری سێیەم لەبیروهۆشی، وایلێکرد کەسی نەدەناسیەوە.

ئەمە بوو، چەند دێرێك لەژیاننامەی ئەم زاتە.

## سەرچاوەکان

کاسێتێکی تۆمارکراو، بەدەنگی مامۆستا مسعود پەرێشان- کوری گەورەی مامۆستا جوهر هێلوەیی.

# خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبداللەی گردعازەبانی



ناوی تەواوی:

(مـــەلا عبداللـــە کـــوڕی شریف کوڕی مەلا قادر) بوو لـــەناو خـــەڵکی بـــە (مـــەلا عبداللـــەی کردعازەبـــان) ناســـرابوو لەســـاڵی (١٩٤٠) لەگوندی کردعازەبانی سەر بەناحیـــــەی قوشـــــتەپە لـەدایکبوو بـوو پـاش (١٢) ساڵ تەمەن لەساڵی (١٩٥٢) دەستی دایە خوێندن و لەسەرەتاوە هانای بردە بەر خواڵێ خۆشبوو مامۆستا مەلا (حمدامین سیساوەیی) لەگوندەکەی خۆیان.

پـاش دەیـان زانـاو گونـدو حـوجرە، تـوانی لـەماوەی (١٢) سـاڵ کۆتـایی بەخوێنـدن بهێنێـێ و دووا مادەکـانی بـردە لای خوالێخۆشبوو مامۆستا مـەلا ابوبکر کۆیی لەسـەر دەستی ئەو زاتـە، بڕوانامـەی مەلایـەتی لەساڵی (١٩٦٤) وەرگرت.

سـەرەتای ژیـانی مەلایـەتی لەسـاڵی (١٩٦٥)وە دەسـتی پێکـردو مـاوەی (٨) ساڵی لەمزگەوتی (بشیریان) بەمەلایەتی بەسەر برد.

لەساڵی (١٩٧٣) گواستیانەوە مزگەوتی گوندی (تورەق) لەخۆرئاوای شـاری هـەولێر، لەسـاڵی (١٩٨٤) خـۆی نـەقلی نـاو شـاری هـەولێر کـردو لەسـەرەتاوە لەمزگـەوتی (شـەهیدین) لەگـەڕەکی نـەورۆز کرایـە ئیمـام و خـەتیب پـاش دەیـان

سـالْ، لـەمانگی کـانوونی یەکـەمی سـاڵی (١٩٩٩) گواسـتیانەوە مزگـەوتی (الماجدی) لەگەڕەکی ئەندازیاران شەش حەوت ساڵێکیش لەوێ مەلایەتی کرد، مامۆستا بەر لەکۆچ کردنی بەچەند مانگێك دووچاری نەخۆشییەکی کوشـندە هـات و ماوەیـەکی زۆر ئـەم دکتـۆرو ئـەو دکتۆریـان پـێ کـرد، تـاکو لـەرۆژی (٢٠٠٧/٣/٣) دووا هەناســـەی داو لەســـەرجەم خـــزم و کـــەس و دۆســـتانی ماڵئاوایی کرد بە بەشداریو ئامادەبوونی جەماوەرێکی زۆر، تەرمی ئەم زاتە لەگۆڕستانی شارەوانی باشوور (معمل قیر) تەسلیم بەخاك کرا.

## لایەنی کۆمەڵایەتی

ئـەم زاتـە، پـاش تـەواوکردنی خوێنـدن، لەسـاڵی (١٩٦٦) ئـافرەتێکی بـەناو (بدریە محمد أمین) خواست و لەم ئافرەتە (٣) کوڕو (١) کچی لەپاش بەجێما.

## ناوی کوڕەکانی:

١- مامۆستا عبدالباسط

٢- مامۆستا عبدالصمد

٣- مامۆستا علی

مامۆسـتا لەژیانیـدا، (٢) حـەجی کردبـوو، یەکـەم لەسـاڵی (١٩٦٩) دووەم لەساڵی (١٩٨٤) ئەمە بوو چەند دێڕێك دەربارەی ژیانی ئەم زانایە.

### سەرچاوەکان:

١- سەردانی مامۆستا عبدالباسط

٢- زانیارییە دەستنووسەکانی ئەم زاتە لەمەڕ ژیانی مامۆستا.

٣- رۆژنامەی یەکگرتوو، ژمارە (٦٣٠) شـەممە ٢٠٠٧/٣/١٣ مامۆسـتا شـێخ فائق نامیق.

## بەشی چوارەم

بۆ پڕکردنەوەی ئەم بەشە، وامان بەباش زانی بەژیاننامەی چەند زانایەکی ناودار لەبواری دەرس وتنەوە لەم سەردەمە، دەقی ئەم کتێبە لەوە زیاتر برازێنینەوەو سەرنجی خوێندەواری لەوە زیاتر پێڕاکیشین.

## مامۆستا مەلا عبداللەی فەرهادی



**ناوی تەواوی:**

(مەلا عبداللە کوڕی فرهاد کوڕی مولود کوڕی عثمان کوڕی حمد) بوو، لەناو زانایان و خەڵکی بە (مەلا عبداللەی فەرهادی) بەناوبانگ بوو.

لەساڵی (١٩١٨)[1] لەگونـدی (لهێبـان) لەبنەماڵەیـەکی هـەژار لـەدایکبوو، لەساڵی (١٩٢١) رەحمەتی باوکی کۆچی دوایی کردو ئەم منداڵەی لەتەمەن (٣)ساڵیدا بەجێهێشت.

سەرەتای خوێندنی لەگوندی گرد عازەبان لای مامۆستا مەلا اسماعیل بوو دەیان مامۆستاو گوندو مزگەوتی کرد تاکو گەیشتە دووا مادەکانی خوێندن، لەوانە:

١- مامۆستا مەلا محمد امین گرد ماملێ.

٢- مامۆستا مەلا صادق فەرهادی برای.

٣- مامۆستا مەلا سعید فەرهادی برای.

٤- مامۆستا مەلا ابراهیم فەرهادی برای.

٥- مامۆستا عبدالقادر عبدالله عبدالقادر لەباداوە

٦- مامۆستا اسماعیل محمد لەگوندی پیرداود

٧- مامۆستا مەلا ابوبکر لەگوندی دووسەرە

لەو گوندانەی کە مامۆستا سەردانی کردووەو بەفەقێیاتی تیایدا ماوەتەوە.

١- مزگەوتی گوندی سیاو

٢- مزگەوتی گوندی کونەبابە

٣- مزگەوتی گوندی خەرابە

٤- مزگەوتی گوندی عاللا

٥- مزگەوتی گوندی گرد مەلا

٦- مزگەوتی گوندی دۆلەزە

٧- مزگەوتی گوندی گردەسۆر

---

1- ئـەم زاتـە لەدیمانەکەمـدا لەگـەڵیا ووتـی (لـەدایك بـووی سـاڵی ١٩٢٢م بـەڵام گـەورەم کردۆتـەوە بـۆ سـاڵی (١٩١٥)، لەلاپـەرە (٢٩١) لـەکتێبی (الأکلیل)دا نووسـیویەتی گوایـە لەدایکبووی ساڵی (١٩١٨)یە منیش وام بەباش زانی ساڵی ناو کتێبەکە بنووسم.

ئەم زاتە ماوەیەکی لەکەرکووک لای ئەم زانایانەی لای خوارەوە بەسەربرد، لەوانە:

١- ماموستا مەلا شێخ محمدی گەرەسۆر لەتەکیەی خەلیفە کەریم لەگەرەکی قۆریە

٢- ماموستا مەلا (احمد روتلی ئێرانی) لەمزگەوتی (حسین بەگ نەفتچی) هەر لەو گەرەکە

٣- ماموستا مەلا انور محمد امین لەگەرەکی پیریادی

٤- ماموستا مەلا رضای واعیظ

## لەماموستاکانی لەشاری بەغدا

١- ماموستا مەلا سلیمان مصطفی سالم تورك

٢- ماموستا مەلا محمد قزلەجی

٣- ماموستا مەلا أمجد زەهاوی

٤- ماموستا مەلا فؤاد الآلوسی

## ماموستا مەلا عبداللەی فەرهادیو بڕوانامەکانی

لەدرێژایی ئەم چەند ساڵەی خوێندن و ئەم شارو ئەو شارکردنەی، توانی لە (٣) زاناوە بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرێ،

لەوانە:

١- ماموستا مەلا سلیمان مصطفی سالم تورك لەساڵی ١٩٤٥

٢- ماموستا مەلا عزالدین مەلا فەندی هەولێر لەساڵی ١٩٤٦

٣- ماموستا مەلا محمد امین بێتواتە هەولێر لەساڵی ١٩٣٩

لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٦ دەستی بەمەلایەتی کردو لەسەرەتاوە لەمزگەوتی گوندی (سورێژە) دامەزرا، ئەوەندە لەوێ نەمایەوە بەرەو شاری هەولێر باری

کردو پاش ماوەیەکی کەم چووە بەغداو توانی بەفەرمانێکی ئەو سەردەمە، خۆی بە (واعیظ متجول) دامەزرێنی لەهەر چوار شاری (کەرکووك و موصل و سلیمانی و هەولێر) بەمەرجێك سەر بەشاری هەولێر بێ، لەهەمان کات کرایە کاتب لەدادگای شەرعی شاری هەولێرو لەرۆژی (١٩٤٧/٦/١٨) دەست بەکار بوو. لەسنووری شاری هەولێر، بەواعیزی سەردانی ئەم ناوچانەی کرد (بەرزان، هاڤینگە باخیف، تێلێ، هیران) هەر لەسالی ١٩٤٧وە تاکو سالی ١٩٥٦ بەواعیزی مایەوە.

لەسالی (١٩٥٩) وەکو هەزارەها مەلای ئەو سەردەمە بەشداری خولی بە (معلم) بوونی کردو پاش تەواوکردنی خولەکە کرایە معلم لەقوتابخانەی سەرەتایی هەر لەسالی (١٩٦٠وە تاکو ١٩٧٦) مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو، لەسالی (١٩٧٦) لەسەر داواکاری خۆی گواستیانەوە سەر میلاکی وەزارەتی ئەوقاف و بەئیمامەتی رەوانەی مزگەوتی مەلا نەبی لەگەڕەکی تەعجیل لەهەولێر کرا.

لەسالی (١٩٨٥) بریاری خانەنشینی دەرچوو، پاش هەول و تەقەلایەکی زۆر، مزگەوتی گەڕەکی زانیاری تەواوکردو تاکو ئەمرۆش ئیمام و خەتیبی ئەو مزگەوتەیە، مامۆستا، ماوەیەکی زۆر خۆی بەتەدریسەوە خەریك کردو دەرسی بەدەیان مەلای ئەم سەردەمە داوە، لەوانە:

١- مامۆستا مەلا صابر

٢- مامۆستا مەلا عبدالواحد

٣- مامۆستا مەلا اسعد

٤- مامۆستا مەلا عبدالقادر

ئەم زاتانە، هەموویان لەگوندی (سورێژە) موستەعید بوون لای مامۆستا مەلا عبداللەی فەرهادی.

## مامۆستاو لایەنی نووسین

مامۆستا دەیان کتێبی جۆراوجۆری نووسیوەتەوە، چ بەزوبانی عەرەبی، چ بەکوردی. لەکتێبەکانی:

١- کتێبی (لمعة البيان في ترتيل وتجويد القران) لەساڵی ١٩٥٢ لەچاپدراوە

٢- کتێبی (ایقاف الخلاف ودر الاعتكاف) لە ١٩٥٦/٦/١٥ لەچاپدراوە

٣- کتێبی (منافع الصوم ومضار الخمر) لە ١٩٥٧/٣/١٢ لەچاپدراوە

٤- الحج المبرور والذنب المغفور) لە ١٩٥٧/٥/٢١ لەچاپدراوە

٥- کتێبی (احسن الصياغة في حلية البلاغة) لەساڵی ١٩٦٧ لەچاپدراوە

٦- کتێبی (منظومة المنقبة النبوية) بەعەرەبی لەساڵی ١٩٨٥ لەچاپدراوە

٧- کتێبی (الأكليل في محاسن اربيل) لەساڵی ٢٠٠١ لەچاپدرا

٨- کتێبی (میرات دابەشکردن) لەساڵی ١٩٨٥ لەچاپدراوە

٩- کتێبی (موجز تاريخ اربيل) دەستنووسە

١٠- کتێبی (ازاهير من رياض الادب) دەستنووسە

١١- کتێبی (منظومة المنقبة النبوية) بەکوردی دەستنووسە

١٢- کتێبی (قدسية المسجد) دەستنووسە

١٣- کتێبی (نزاهة القران الكريم من الشعر) دەستنووسە

١٤- کتێبی (تبصرة المبتدي وتذكرة المنتهى) دەستنوونسە

١٥- کتێبی (وجها لوجه رسول الله (ص)) دەستنووسە

١٦- کتێبی (منهاب الحكمة) دەستنووسە

١٧- کتێبی (بعضِ آثار ومزارات ومساجد أربيل) دەستنووسە

١٨- دیوانێکی شیعر لەژێر نازناوی (حزنی فەرهادی)

ئەمە بوو چەند دێڕێك لەژیاننامەی ئەم زانا ناوداره.

شەممە

٢٠٠٦/١٢/١٢

**سەرچاوەكان:**


١- سەردان و دیمانەی خودی مامۆستا لەنزیكەوەو گفت وگۆی راستەوخۆ لەبارەی ژیانیەوە.

٢- كتێبی (الأكليل في محاسن اربيل) دانانی مامۆستاو بلاوكراوەی وەزارەتی ئەوقاف لەهەرێمی كوردستان لاپەڕە (٣٩١) ساڵی ٢٠٠١/ هەولێر.

٣- كتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەكیەكانی ناو شاری هەولێر) دانانی (بەندە)و بلاوكراوەی وەزارەتی ئەوقاف لەهەرێمی كوردستان ساڵی ٢٠٠١، هەولێر.

٤- كتێبی (هەولێرم وادیوەو بیستووە) بەرگی دووەم مامۆستا سەید مولود بێ خاڵی. ١٩٩٧.

# (ماموّستا مەلا سەید عبدللەی گردەسوّری



**ناوی تەواوی:**

(سەید عبداللە کوڕی شێخ سلیمان کوڕی شێخ محمد کوڕی شێخ ابراهیم) بوو، بەرەگەز خوّی بەنەوەی سەیدەکانی (پیر خدری شاهوّ) دادەنا لەناو خەڵکی هەر بە (مەلا سەید عبداللەی گردەسوّری) بەناوبانگ بوو.

لەساڵی ١٩٢٠ لەگوندی (چاڵە گردەڵە) لەسنووری شاروّچکەی (تەقتەق)، لەبنەماڵەیەکی ئاین پەروەر لەدایکبوو سەرەتای خوێندنی لەلای باوکییەوە دەستی پێکرد، پاشان چەندین زانای تری کرد، لەوانە:

١- خوالێخوّشبوو ماموّستا مەلا حسن باقرتەیی

٢- خوالێخوّشبوو ماموّستا مەلا شریف دووشیوانی

٣- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا طیب دووشیوانی

٤- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا اسماعیل دیبەگەیی

٥- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا ابوبکر کۆیی

دووا مادەکانی بردە خزمەت خوالێخۆشبوو، جەنابی شێخ (مصطفی نەقشبەندی)، هەر لەسەر دەستی ئەو زاتە لەساڵی (١٩٤٥) پاش دەیان ساڵ خوێندن، بڕوانامەی زانستی (١٢) عیلمی وەرگرت.

سەرەتای ژیانی مەلایەتی لەگوندی (بەردە سپی)وە دەستی پێکرد، نزیکەی (١٠) دانە ساڵ لەوێ بەمەلایەتی مایەوە، پاشان کرایە (واعیزی گەریدە) و ڕەوانەی گوندی گردەسۆر کرا، پاش چەند ساڵێك ڕەوانەی شاری کۆیێ کراو بەئیمام و خەتیب و مودەریس لەمزگەوتی (حاجی محمود ئاغا) داندرا.

هەر بەم پلەیە، گەڕایەوە گوندی (گردەسۆر)، بە هۆی زۆر مانەوەی لەم گوندە، ناوی ئەم گوندە بەناوی مامۆستاوە لکاو بوو بەناز ناوی. لەساڵی (١٩٨٥) بەماڵەوە بۆ ناوشاری هەولێر باری کردو لەمزگەوتی (اسماعیل منتکاوە) بەئیمام دامەزرا هاوکات یەکێ بوو لەمامۆستایانی پەیمانگای ئایینی لەهەولێر، لەهاوڕێیەکانی ئەم زاتە:

١- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا فائز مەلا عبدالله

٢- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا صادق مەلا محمد پلکێ

٣- مامۆستا مەلا عمر حاجی قادر

لەو زانایانەی کەدەرسیان لای ئەم زاتە خوێندووە

١- مامۆستا مەلا عمر حاجی قادر

٢- مامۆستا مەلا سەید محمد سەید اسماعیل پیرداود

٣- مامۆستا مەلا مجید ئازیانەیی

٤- مامۆستا مەلا محمد ئازیانەیی

٥- مامۆستا مەلا عمر مەلا حمدامین سوێری

٦- مامۆستا مەلا شێخ محمد شێخ عبدالكريم بەرزنجی
٧- مامۆستا مەلا عبدالرحمن شێخ عبدالكريم بەرزنجی

لەوانەی مامۆستا سەردانیانی دەکردو پەیوەندی لەگەڵ هەبوون

١- جەنابی شێخ مصطفی-ی نەقشبەندی
٢- مامۆستا مەلا سەید محمد پیرداود
٣- مامۆستا مەلا عبداللەی فەرهادی

ئەم زاتە، مودەریسێکی بالاّ دەست بوو لەم بووارانە. (عقائد، فقه، تفسير، نحو، صرف، تحفه، مطول، جامي، الشمسيه، عبدالله يزدی)

ئەمە بوو چەند دێڕێك لەژیاننامەی مامۆستا مەلا سەید عبداللەی گردەسۆری.

دووشەممە

٢٠٠٦/١١/٢٠

سەرچاوەکان:

١- سەردان و دیدەنی خودی مامۆستا لەرۆژی دیاری کراو لە ماڵی خۆی لەگەڕەکی مەنتکاوە.

# ( مامۆستا مەلا علی بیرە عارەبان



ناوی تەواوی:

(مەلا علی کوڕی اسماعیل کوڕی مەولود کوڕی محمد)ە بەرەگەز، لەهۆزی (کارەوان)ە لەناو خەڵکی بە (مەلا علی بیرەعارەبان) بەناوبانگە، لەساڵی (١٩٢٥) لەگوندی (سۆربەشی) خدری پاشا، لەدەشتی هەولێر لەدایکبووە. سەرەتای خوێندنی لەلای مامۆستا مەلا (عبداللەی مەمی خەلی) لەگوندی سۆربەشەوە دەستی پێکرد. تاکو کۆتایی بەخوێند هێنا، دەیان زانای کرد، لەوانە:

١- مامۆستا مەلا محمد امین لهیبان

٢- مامۆستا مەلا عبداللەی فەرهادی

٣- مامۆستا مەلا اسماعیل ناقص- یدی قزلر

٤- ماموّستا مەلا عمری رەش لەگوندی قەشقە

٥- ماموّستا مەلا طیب دووشیوانی

٦- ماموّستا مەلا عثمان دۆڵەزە

٧- ماموّستا مەلا شریف گردەسۆری

٨- ماموّستا مەلا محمد امین سوێری

٩- ماموّستا مەلا ابوبکر کۆیی

هەندێ لەدووا مادەکانی لای ماموّستا مەلا ابوبکر کۆیی تەواوکرد، بەڵام بڕوانامەی زانستی لای ئەو وەرنەگرت. لەسەرەتاوە نزیکەی (١٥) دانە ساڵ، لەمزگەوتی گوندی بیرە عارەبان وەکو ئیمام و خەتیب بەسەر برد، لەسەرەتای ساڵانی حەفتاکان هاتە شاری هەولێرو لەمزگەوتی (حاجی مولود) یان (شێخە رەشکە) بەئیمام دامەزرا.

لەماوەی چەند ساڵی رابووردو، خوالێخۆشبوو ماموّستا مەلا عبدالکریم مردس، بڕوانامەیەکی بۆ نووسیو بەهاوڕێیەکی دا بۆی ڕەوانەکرد.

کەوا بۆ ماموّستا مەلا علی بیرە عارەبان، مجازی ماموّستا (مەلا عبدالکریم مدرس)ە لەبەغدا.

## لە · دۆستەکانی

١- ماموّستا مەلا سەید محمد پیرداودی رەحمەتی

٢- ماموّستا مەلا سەید عبدللەی گردەسۆری

٣- ماموّستا مەلا عبداللەی فەرهادی

٤- ماموّستا مەلا عبدالصمد مەلا محمود

٥- ماموّستا مەلا عمر مەلا حمدامین سوێری

ماموّستا لەژیانیدا، (٢) ژنی هێناوە، یەکەم لەساڵی (١٩٤٩) دووەم لەساڵی (١٩٦١). لەژنی یەکەم، تەنها کوڕێکی بەناو (ماموّستا عبدالله)ی هەیە، ماموّستا

عبدالله لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٢)و مامۆستای ناوەندیە لەهەولێر. هاوکات لەگەڵ (٢) کچ، لەژنی دووەم ئەم کوڕانەی هەیە:

١- کاک ئەمجەد- کاسبە

٢- کاک ماجد- کارمەندی میرییە

٣- کاک هیوا- پۆلیسە

هاوکات لەگەڵ ئەم کوڕانە، (٣) کچیشی لەژنی دووەم هەیە. مامۆستا ماوەیەکی زۆرە، بەهۆی نەساغیو کەم توانایيو بەساڵاچوونیا، توانای هات و چۆی مزگەوتی نەماوە، زۆربەی کاتی لەماڵەوە بەسەر دەبات.

پێنج شەممە

٢٠٠٦/١١/١٦

سەرچاوەکان:

هەموو ئەم زانیاریەم لەخودی جەنابی مامۆستا وەرگرت لەدیمانەیەك لەماڵی خۆی لەگەڕەکی ڕاپەڕین لە هەولێر.

# کورتەیەك لەژیاننامەی زانای ناودار

# مامۆستا مەلا ممدوح مزوری



ناوی تەواوی:

(مەلا ممدوح کوڕی مەلا سلیم کوری مەلا نجم الدین)ە بەرەگەز لەهۆزی (مەزوریان)ە، لەساڵی ١٩٢٨ لەگوندی (ئیدلێی) لەسنووری شارۆچکەی (مێرگەسۆر) لەبنەماڵەیەکی ئاین پەروەر لەدایك بووە، سەرەتای خوێندنی لەخزمەت رەحمەتی باوکییەوە دەستی پێکردوە پاش تەواوکردنی قورئانی پیرۆزو چەند کتێبێك، هانای بردۆتە بەر دەیان زانای ئەو سەردەمە لەوانە:

١- مامۆستا مەلا قاسم لەگوندی (پێندرۆ)

٢- مامۆستا مەلا یحیی گەردی لەگوندی (دەریا سۆر)

٣- مامۆستا مەلا محمد ئەلگوشی لەگوندی (هەورەس) لەشاری (ورمێ) لەئێران

٤- مامۆستا مەلا محمد بارزانی لەگوندی (قاهرە) لەدەڤەری زێوە

٥- مامۆستا مەلا هبة الله ئەفەندی لەشارۆچکەی ئاکرێ

٦- مامۆستا مەلا شێخ محمد بالیسانی، لەگوندی بالیسان

٧- مامۆستا مەلا مصطفی-ی هیرانی لەگوندی (بێلینگێ)

٨- مامۆستا مەلا علی مامە جەلکە لەگوندی مامە جەلکە

دوو قۆناغی خوێندنی بردە خزمەت زانای ناوداری کورد، مامۆستا مەلا عبدالكريم ئەفەندی خەیلانی لەشاری (ڕەواندوز) و هەر لەسەر دەستی ئەو زاتە بڕوانامەی مەلایەتی (١٢ عيلم) وەرگرتووە.

لەساڵی (١٩٥٦) کۆتایی بەخوێندن هێنا، سەرەتای کاری مەلایەتی لەگوندی (کەرەوە)وە دەستی پێکرد، پاش یەك دوو ساڵ باری کردە شاری (ڕەواندز) زیاتر لە (٢٥) دانە ساڵ لەوێ مایەوە لەساڵی (١٩٨٥) بەماڵەوە بەرەو ئێران بەڕێکەوت، نزیکەی شەش حەوت ساڵ لەشاری (ورمێ) لەئێران مایەوە لەکۆتایی ساڵی ١٩٩١ گەڕایەوە کوردستان و لەشاری هەولێر جێگیر بوو، هەر لەسەرەتاوە بەئیمام و خەتیب و مودەریس لەمزگەوتی حاجی جمال بەزاز دامەزرا. نزیکەی (١٥) دانە ساڵی لەم مزگەوتە بەسەربرد، لەڕۆژی (٢٠٠٦/٣/٢١) (ڕۆژی نەورۆز، لەم مزگەوتەوە چووە مزگەوتی (ئیمام علی) لەسەر شەقامی (١٠٠) مەتری نزیك چوار ڕێیانی (حی الزراعة).

## مەلا ممدوح و لایەنی تەدریس

ئەم زاتەش وەکو زۆرینەی زاناکانی ئەم شارە، دەیان زانای ئایینی پێگەیاندو دەرسی پێوتن، لەوانە:

١- مامۆستا مەلا مولود- ئێستاکە لەهەولێر مەلایە

٢- مامۆستا مەلا علی خەتێ

٣- مامۆستا مەلا محمد کمال هەروتی لەمزگەوتی (الكويتی) لەگەڕەکی تەیراوە ئیمامە

٤- مامۆستا مەلا فتح الله- لەمزگەوتەکانی شارۆچکەی (خەلیفانە)

وەکو ئامارەمان بۆکرد ئەم زاتە بۆ ماوەی (٥٠) ساڵ دەچێ مەلایەو مودەریسە، لەم ماوەیە سەدان زانای کورد لای ئەم زاتە فەقێ بوونە، بڕوانامەی مەلایەتی داوەتە (٢٢) کەس لەوانە:

١- مامۆستا مەلا مسکین معاص

٢- مامۆستا مەلا سامی خەلیفانی

٣- مامۆستا مەلا ادریس زراری

٤- مامۆستا مەلا محمود زراری

٥- مامۆستا مەلا عبدالرحمن رانیەیی- لەدارەتوو مەلایە

٦- مامۆستا مەلا سلیم- بناری چیای کۆسرەت

جگە لەم ناوانە، دەیان کەسی دی فەقێی ئەم زاتەیان کردووە، لەوانە:

١- مەلا ئومێد دەسکۆ حمەشریف

٢- مەلا عبدالباقی- هاولاتی تورکیایە.

## لەفەقێ کۆنەکانی:

١- مامۆستا مەلا محمد امین رەواندزی- مزگەوتی حاجی یحیی

٢- مامۆستا مەلا فاروق خۆشناو

٣- مامۆستا مەلا بهاءالدین باڵەکایەتی

٤- مامۆستا مەلا ڕێبوار- لەگوندی میرزا احمد مەلایە

٥- مامۆستا مەلا محمد- لەگوندی شاوێس مەلایە

مامۆستا، هاوکات لەگەڵ ئەرکی تەدریس و مەلایەتی، دەیان کتێبی نووسیوە، لەوانە:

١- کتێبی (مێژووی شاری ڕەواندز) لەلایەن دەزگای (تەفسیر)وە لە چاپدراوە.

٢- کتێبی (بنەماڵە ناودارەکانی ڕەواندز) لەژێر چاپدایە

٣- دیوانێکی شیعر بەناوی (دیوانی مەزوری)

٤- کورتەیەك لەمێژووی گوندەکەی خۆی (ئیدلیێ)

٥- کتێبی (دیوان الخطاب) بەهەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی

٦- کتێبی (شۆڕشی یەکی ئەیلول)

٧- كتێبی (مناسك الحج) بەناونیشانی (دلیل الحج والعمرة) بەعەرەبی.
ئەم زاتە وەکو مەلایەکی کورد، دەیان ساڵ تەمەنی بەمەلایەتیەوە لەشاری (ورمێ) لەئێران بەسەربرد، هاوکات سەردانی وڵاتی تورکیاشی کردووە.

## (لەئەرك و بەرپرسیی)

١- ئەندامی دەستەی فەتوا دانە لەهەولێر
٢- ئەندامی ئەنجومەنی باڵایە لەدەزگای ئەوقاف لەهەولێر

هاوکات خاوەن پلەو پایەی بەناوبانگی خۆیەتی، کەم کەس هەیە لەزانایانی ئەم شارە، ناوی مامۆستا مەلا (ممدوح مزوریان) بەر گوێ نەکەوتبێ.
ئەمە بوو کورتەیەك لەژیاننامەی ئەم زاتە

شەممە
٢٠٠٦/١١/٢٤

**سەرچاوەکان:**

١- سەردان و دیدەنی خودی مامۆستا خۆی لەمزگەوتی ئیمام علی و لەماڵی خۆی لەگەڕەکی مفتی لەهەولێر.
٢- تەواوی زانیاریەکان لەسەر زاری خۆیەوە خراوەتە سەر کاغز.



# کورتەیەك لەژیاننامەی مامۆستا مەلا بهاءالدین خەتیٚ[1]

ناوی تەواوی (مەلا بهاءالدین کوڕی شێخ احمد کوڕی مەلا عبداللەی خەتیٚ)یە لەناو خەڵکی بە مەلا بهاءالدین خەتی ناوی داوەتەوە، لەساڵی (١٩٢٩) لەگوندی خەتیٚ، لەبنەماڵەیەکی ئاین پەروەر لەدایکبووە، لەتەمەنی سیٚ ساڵیدا، باوکی کۆچی دوایی کردو بەبیٚ باوك لەئامێزو سایەی (مەلا ابراهیم) مامی گەورە بوو، سەرەتای خوێندنی لەلای (مەلا عبدالله)ی ئامۆزایەوە دەستی پێکرد، دوایی ئەم مەلایە، چووە لای مامۆستا مەلا (رسول هەرتوەکەوی) پاش ئەم دوو زاتە، چووە خزمەت مامی (مەلا ابراهیم) و پاشان خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا شێخ محمد بالیسان لەمەڵبەندی بالیسان. پاشان رۆیشتە گوندی (سپێندارە) و لای مامۆستا مەلا محمد امین سوێری، بۆ جاری دووەم گەڕایەوە لای مامۆستا مەلا ابراهیم مامی و دەیان کتێبی لا تەواوکرد، تاکو گەیشتە کتێبی (تهذیب الکلام). پاشان هاتە شاری هەولێرو هانای بردە بەر زانای ناوداری ئەو سەردەمە، مامۆستا مەلا صالح کۆزەپانکەیی و تەواوی کتێبەکانی تەواوکردو لەساڵی (١٩٥٣) بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرت.

لەوە دووا گەڕایەوە گوندی خۆیان و لای مەلا ابراهیم مامی دەستی بە تەدریس کرد. هەر لەساڵی (١٩٥٣وە تاکو ١٩٦٥) لەویٚ مایەوە. پاشان بەهۆی نالەباری بارودۆخ، بەخانەوادەوە هاتە شاری هەولێر، ماوەی ساڵ و نیویەکی

---

1- خەتیٚ- گوندێکە لەناوچەی خۆشناوەتی و سەر بەقەزای شەقڵاوەیە.

لەمزگەوتی (التی برماغ) بەسەربرد، رۆژانە دەرسی مەلایەتی بەمامۆستا مەلا (محمدامین) دەدا. پاشان لەگەڵ چەند زانایەك کرانە مودەریس لەمزگەوتی گەورەی ناو بازاڕ (حاجی داود).

## لە مامۆستاکانی هاوڕێی لەو سەردەمە:

١- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا صالح کۆزەپانکە

٢- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا ابوبکر کۆیی

٣- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا طاهر سوسەیی

لەساڵی (١٩٦٧) لەلایەن ئەوقافەوە کرایە ئیمام و خەتیب و مودەریس لەمزگەوتی (سەید غریب سەید فرج) لەگەڕەکی سێتاقان، وا بۆ (٤٠) دانە ساڵ دەچێ، ئەم زاتە لەم مزگەوتەیەو بەردەوام بەهەموو تواناوە لەخزمەت کردنی ئاینە.

لەو مەلایانەی کە فەقێی ئەم زاتە بوو، چ لەگوندی خەتێ، چ لەناو شاری هەولێر زۆرن، لەوانە:

١- مامۆستا مەلا اسماعیل بیراوەیی

٢- مامۆستا مەلا خدر بالیسانی

٣- مامۆستا مەلا یاسین مەلا قادر بالیسانی

٤- مامۆستا مەلا محمدامین مەلا قادر بالیسانی

٥- مامۆستا مەلا علی عولا خەتێ

٦- مامۆستا مەلا عبداللە حاجی احمد خەتێ

٧- مامۆستا مەلا طاهری گەرووە گەرەوە

٨- مامۆستا مەلا عبدالواحد باڵەکی

٩- مامۆستا مەلا شێخ ابراهیم بالیسانی لەهەولێر

١٠- مامۆستا مەلا محمد نۆغەرانی لەهەولێر

١١- مامۆستا مەلا علی دووگردکانی

١٢- مامۆستا مەلا محمد هێلەوەیی

١٣- مامۆستا مەلا محمد سەران

١٤- مامۆستا مەلا محمد شکارتە

١٥- مامۆستا مەلا محمد شێخ مصطفی (محمد شێخ سپی)

١٦- مامۆستا مەلا علی مامك

١٧- مامۆستا مەلا اسماعیل مەلا شێخ عزالدین نەقشبەندی

ئەمە ناوی هەندێ لەموجازەکانی ئەم زانایەیە:

١- مامۆستا مەلا محمد نۆغەرانی

٢- مامۆستا مەلا عبدالله خەتێ

٣- مامۆستا مەلا صباح جۆلەمێرگی

٤- مامۆستا مەلا عبد المقتدر تارینەیی

٥- مامۆستا مەلا احمد وەرتێ

٦- مامۆستا مەلا یونس باویانەیی

٧- مامۆستا مەلا عبدالجبار شەرەکان

٨- مامۆستا مەلا ابراهیم کەرکووکی

٩- مامۆستا مەلا طاهر وەرتێ

١٠- مامۆستا مەلا سامان بناوەیی (دۆڵی ئاڵانە)

١١- مامۆستا مەلا هندرێن بالیسانی

١٢- مامۆستا مەلا فریدون بالیسانی

١٣- مامۆستا مەلا نجاة سورچی

١٤- مامۆستا مەلا محمد هەروتەیی

١٥- مامۆستا مەلا رزگار شێخ بزێنی

١٦- مامۆستا مەلا کارزان محمد سیساوەیی

١٧- مامۆستا مەلا کامران هەروتەیی

١٨- ماموّستا مەلا طاهر سورچی

١٩- ماموّستا مەلا بیستون حسین شێرەیی

ماموّستا مەلا بهاءالدین لەگەڵ ئەخیاریو بەسالاّچوونیدا، رۆژانە دەیان فەقێ چ لەمزگەوتی خۆی، چ لەمزگەوتی حاجی ابراهیم گەردیو چ لەمزگەوتی شێخ محی الدین شێخ محمد صالح بەرزنجی لەگەڕەکی برایەتی بۆ دەرس وەرگرتن رووی تێدەکەن لەوانە:

١- مەلا علی محمد هەروتی

٢- مەلا ادریس حسین هەروتی

٣- مەلا فرهاد رووف بالیسانی

٤- مەلا هێمن علی خەتێ

٥- مەلا ابراهیم محمد هەروتی

٦- مەلا زێوەر خرواتەیی

٧- مەلا صالح زیارەتی

٨- مەلا خالص سەید رسول

چەند لایەنێکی تری ژیانی ئەم زاتە

- یەکێکە لەمەحسوبەکانی خوالێخۆشبوو شێخ مصطفی شێخ ابوبکر نەقشبەندی.

- وەکو ئەدەب دۆستێك، هەندێ هۆنراوەی هەیە بەلاّم بەچاپ نەگەیشتوون.

- لەسەرەتای حەفتاکان، ماوەی چەند ساڵێك وەکو واعیزیەك لەم دەڤەرە گەڕا.

- لەهەمان کات، هەر لەسەرەتای سالاّنی حەفتاکان وەکو (مدرس) لەم مەدرەسانە دەرسی وتۆتەوە.

١- مەدرەسەی مزگەوتی گەورەی سەر قەلاّ

٢- مەدرەسەی مزگەوتی شێخ محمدی قازی

٣- مەدرەسەی مزگەوتی گەورەی ناو بازاڕ (مەلا داود)

- لەساڵی ١٩٩٤ بۆ ماوەی چوار ساڵ، ئەندامی ئەنجومەنی زانستی باڵای دەزگای ئەوقاف بوو لەهەولێر.

- ئەندامی لێژنەی باڵای فەتوایە لەیەکێتی زانایانی کوردستان لقی هەولێر.

- لەساڵی (٢٠٠٥) دووبارە لە بەئەندام بوون لەئەنجومەنی زانستی باڵای ئەوقاف بەردەوامە.

ئەمە چەند دێرێك بوو لەژیاننامەی مامۆستا مەلا بهاءالدین.

پێنج شەممە

٢٠٠٦/١٢/٧

سەرچاوەکان:

١- سەردانی خودی مامۆستا لەمزگەوتەکەی.

٢- گۆڤاری (خۆری ئیسلام) ژمارە (٢٩) لاپەڕە (٣٨)- ٢٠٠٥.

٣- کتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی ناو شاری هەولێر) دانانی (بەندە)و بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف- هەولێر ٢٠٠١.



# مامۆستا مەلا عبداللطيف ميران

**ناوی تەواوی:**

(مەلا عبداللطيف کوڕی مەلا اسماعيل کوڕی کريم)ە، بەرەگەز لەهۆزی (ميرانی)[1] يە لەساڵی ١٩٣٣ لەناحيەی (بجيل)ی سەر بەشاری ئاکرێ لەدايکبووە، سەرەتای خوێندنی لەلای باوکييەوە دەستی پێکردووە، پاش تەواوکردنی قورئانی پيرۆزو چەند کتێبێك بەرەو ناوچەی هەولێر هاتووەو هانای بردۆتە بەر ئەم زاتانە:

١- مامۆستا مەلا عمر کەوور- لەگوندی کەوور

٢- مامۆستا مەلا عبدالله عثمان- لەگوندی عەوێنە

٣- مامۆستا مەلا اسماعيل قەتەويی- لەگوندی شێخ شەروان

٤- مامۆستا مەلا عبداللەی سێبردانی لەگوندی سێ بەردان

٥- مامۆستا مەلا عثمان ئەفەندی لەگوندی سيساوە

٦- مامۆستا مەلا سعيد مائی لەخانەقای شێخ مزهەر لەهەولێر

٧- مامۆستا مەلا شێخی هيرانی لەشارۆچکەی هيران.

دووا مادەکانی بردۆتە خزمەت خواليێخۆشبوو مامۆستا مەلا عبدالمجيد گەڕاوی لەگوندی (تۆبزاوە) لەخۆرئاوای شاری کەرکووك پاش گەڕانەوەی

---

1- زۆرينەی ئەم هۆزە، لەگوندی (گردەشێرە) لەناوچەی بەڕانەتی نيشتەجێن.

ماموستا مەلا عبدالمجید گەڕاوی لەگوندی تۆبزاوە بۆ (پیرمام) ماموستا مەلا عبداللطیف و ماموستا مەلا احمد مەتاوی چوونە لای و بڕوانامەی مەلایەتیان وەرگرت. سەرەتای ژیانی مەلایەتی لەگوندی (قوچە بلباس)[1] وە دەستی پێکرد، پاش بەسەربردنی (١٤) دانە ساڵ لەو گوندە، هەستا بە بەشداری کردن لەتاقیکردنەوەیەکی تایبەتی سەر بە (پەیمانگای ئایینی) لەهەولێرو بەسەرکەوتوویی ئەو تاقیکردنەوەیەی بڕی. پاش وەرگرتنی بڕوانامەی ئەو پەیمانگایە، هەستا بەسەردانی شاری بەغداو بەشداری کردن لەئەزموونێکی تاقیکردنەوەی وەزارەتی ئەوقاف. لەپاش دەرچوون، لەرۆژی (١٩٧٥/١/١٨) کرایە ئیمامی مزگەوتی (خواجە محمود) لەشاری (البصرە) (٧) مانگی لەوێ بەسەربردو رەوانەی شاری دهۆك کراو بەهەمان پلە لەمزگەوتی گەڕەکی (گەلی) دامەزرا. (٣) ساڵ لەو مزگەوتە مایەوە. پاشان گواستیانەوە مزگەوتی (مەلا عمر) لەشاری کۆیە لەساڵی (١٩٧٩- ١٩٨٠) لەوێ ئیمام بوو، پاشان گواستیانەوە بۆ مزگەوتی (خالد کوڕی ولید) لەگەڕەکی (الدواجن) لەهەولێر، لەکاتی کردنەوەی مزگەوتی (حاجی اسماعیل یعقوبی)[2]، ماموستا مەلا عبداللطیف یەکەم مەلا بوو لەو مزگەوتە. بۆ (٢١) ساڵ دەچێ ماموستا لەم مزگەوتە ئیمام و خەتیب و مودەریسە. لەوانەی رۆژی لەرۆژان فەقێی ئەم زاتە بوونە، ئەمانەن

١- ماموستا مەلا طلعت

٢- ماموستا مەلا محمد ابوبكر گاینجی

٣- ماموستا مەلا رزگار- ئێستاکە لەبنەسلاوە مەلایە.

---

1- گوندێکە سەر بەناحیەی قوشتەپەیە.

2- بڕوانە ل/٢٥١ لەکتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوتەکان) نووسینی بەندەو بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف- ٢٠٠١.

سەرەڕای ئەم ئەرکانە، لەیەکەم رۆژی هاتنە هەولێرەوەی، جەنابیان کرانە ماموستای وانەبێژ لە (پەیمانگای ئایینی) کەئێستاکە لەمزگەوتی (الصواف)[1] لەهەولێر. زیاتر لە (٢٠) ساڵە ماموستا لەم پەیمانگایە دەرس دەڵێتەوەو، سەدان تەلەبەی پەیمانگا، قوتابی ئەو بوونە. وێڕای ئەوەی کەمجازی خوالێخۆشبوو ماموستا مەلا (عبدالمجید گەڕاوی)یە، بەڵام تاکو ئەمڕۆ بڕوانامەی مەلایەتی بەکەس نەداوە.

## ماموستاو لایەنی نووسین

ئەم زاتەش وەکو زۆرینەی زاناکان، ناو بەناو دەستی داوەتە قەڵەم و هەندێ بابەتی نووسیوە. لەوانە:

١- نووسینی شەرحێکی تێرو تەسەل لەسەر کتێبی (عوامل الجرجانی) بەزمانی عەرەبی.

٢- نووسینی (اعراب)ی قەسیدەی بوردییە بەماناکانیەوە.

٣- نووسینی شەرحێك لەسەر کتێبی (تصریف مەلا علی).

٤- نووسینی لەسەر (رسالة الاستعارة) علم البلاغة کەماموستا مەلا ابوبکر سارتکەیی دایناوە،

## هەندێ لایەنی ژیانی ماموستا

١- ئەندامی لقی دووی یەکێتی زانایانی ئایینیە لەهەولێر.

٢- لەگەڵ نەبوونی پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ پارت و لایەنە سیاسییە کوردییەکان، بەڵام خاوەن هەستێکی بەرزی کوردایەتیە.

---

1- بڕوانە لاپەڕە (٣١٩) لەهەمان سەرچاوەی پێشوو

٣- مامۆستا لەساڵی (١٩٥٤) یەکەم ژنی هێناو لەساڵی (١٩٦٧) دووەم. لەم دوو ئافرەتـە، (٨) کـوڕو (٤) کـچی لەژیاندایـە. یـەکێ لـەکوڕەکانی بـەناوی (عبدالحکیم) لەمزگەوتی حاجی اسماعیل یەعقوبی ئێستاکە بانگدەرە.

٤- ئـەم زاتـەش وەکـو زۆرینـەی ئـەم نەتەوەیـە، لەسـاڵانی شەسـتەکان، لـەو کاتـەی لەگونـدی (قوچـە بلبـاس) بـوو دووچـاری گـرتن و ئەشـکەنجەو حـەپس کردن بوو.

٥- بـەهۆی ئـەو هاتوچـۆو دۆسـتایەتیەی کـە لـەنێوان مامۆسـتاو شـێخ مـصطفی-ی نەقـشبەندی هـەبوو. لـەرێگای ئـەو زاتـەوە بـوو بەیـەکێ لەموریدەکانی رێبازی (نقشبندی) تاکو ئەمڕۆش پەیوەستە بەو موریدییەوە.

## لەدۆستە خۆشەویستەکانی

١- مامۆستا مەلا عبدالرحمن شەمشوله
٢- مامۆستا مەلا جلال عبدالله تەرجانی
٣- مامۆستا مەلا محمد عبدالله تەرجانی
٤- مامۆستا مەلا محمد عبدالله قادر گردەشێری
٥- مامۆستا مەلا انور حمدامین قادر
٦- مامۆستا مەلا انور عبدالله گۆمە گرویی- انور سەعاتچی
٧- مامۆستا مەلا حسن مولود ئیمامی مزگەوتی خدیجە الکبری
٨- مامۆستا مەلا عبدالرحمن گردجۆتیاری.

٢٠٠٦/١٢/٤

**سەرچاوەکان:**

سەردان و دیدەنی خودی مامۆستا لەماڵی خۆی لەبەرواری ئاماژە بۆ کراو.



# کورتەیەک لەژیاننامەی ماموّستا مەلا محمدامین رەواندزی

ناوی تەواوی:

(مەلا محمد امین کوڕی عبدالله کوڕی سلیمان)ە لەناو خەڵکی بە (مەلا محمد امین رەواندزی) ناسراوە، لەساڵی (١٩٤١) لەشارەکەی (کۆر پاشا) لەدایك بووە. سەرەتای خوێندنی هەر لەوێیەوە دەستی پێکردووە، پاش دەیان ساڵ خوێندن، لەساڵی (١٩٦١) لەتەمەنی (٢٠) ساڵی بڕوانامەی مەلایەتی لەسەر دەستی خوالێخۆشبوو ماموّستا مەلا عبدالکریم ئەفەندی کوڕی مەلا اسعد ئەفەندی کوڕی مەلا عمر ئەفەندی خەیلانی وەرگرتووە. ماموّستا مەلا عبدالکریم ئەفەندی مجازی (مەلای خەتێ) بوو، پاش دەیان ساڵ مانەوە لەشاری رەواندز، لەسەرەتای ساڵانی هەشتاکانەوە هاتۆتە ئەم شارەو یەکەم ئیمام و خەتیبی ئەم مزگەوتەیە (مزگەوتی حاجی یحیی) هەر لەو کاتەوە، سەرەڕای ئەرکی مەلایەتی، بەردەوام دەرسی بەدەیان فەقێی ئەم مزگەوتە ووتوە. لەهەندێ بوواری دیش، رەوشی باڵای هەیە، وەکو

١- ئەندامی لێژنەی باڵای فەتوایە لەیەکێتی زانایانی کوردستان لقی هەولێر.

٢- ئەندامی ئەنجومەنی زانستی باڵایە لەوەزارەتی ئەوقاف، لەهەرێمی کوردستان.

٣- مامۆستایەکی بالاّ دەستە لەبوواری ووتنەوەی ئەم مادانە (نحو، صرف، عقائد المنطق، اصول الفقە، تفسیر، البلاغة، مصطلح، حدیث، علوم القران، التجوید).

لەسەر دەستی ئەم زاتە تاکو ئەمڕۆ (١٧) زانای ئایینی بڕوانامەیان وەرگرتووە، ئەم زاتە لەگەڵ زۆری ئەرك و فەرمان، لایەنی نووسینی فەرامۆش نەکردو چەندین کتێبی بەهەردوو زمانی کوردیو عەرەبی دانا، لەوانە:

١- کتێبی (المأول في علم الاصول).

٢- کتێبی (البهجة المرضية في شرح البيقونية).

٣- کتێبی (عروة الوثقى) دەست نووسە.

٤- کتێبی (جليس الوحدة وانيس الوحشة) دەستنووسە.

٥- کتێبی ژیاننامەی پێغەمبەر بەکوردی دەستنووسە.

٦- دیوانێکی شیعری هەمەڕەنگ.

ئەمە بوو چەند دێرێك لەژیاننامەی مامۆستا مەلا حمدامین ڕەواندزی.

چوارشەممە

٢٠٠٦/١١/٨

سەرچاوەی ئەم زانیاریانە:

١- سەردان و دیدەنی خودی جەنابی مامۆستا لەبەرواری دیاری کراو لەمزگەوتی حاجی یحیی لەگەڕەکی مەهابات لەهەولێر.

# ( مامۆستا مەلا عبدالقادر بەحرکەیی )



ناوی تەواوی:

(مـــەلا عبـــدالقادر کـــوڕی رســـول کـــوڕی پیرداود)ە، لەناو خەڵکی بـــە (مـــەلا عبـــدالقادر بەحرکـــە) نـــاو دەبـــرێ، لەساڵی ١٩٤٥ لەگونـدی بەحرکـە لـەدایك بـووە، سەرەتای خوێندنی هەر لەوێیەوە دەستی پێکردووە، پاش تەواوکردنی قورئانی پیرۆز، وازی لـەحوجرە هێنـاوەو لەقوتابخانە سـەرەتاییەکان نـاوی خـۆی نووسـیوە، پـۆلی یـەك و دووی تەواوکردووە دووبارە گەڕاوەتەوە خوێندنی حوجرە.

دەیان حوجرەو مەلای بۆ خوێندن کردووە، لەوانە:

١- مەدرەسەی گوندی گەڕاو.

٢- مەدرەسەی گوندی گۆڕە شێرە.

٣- مەدرەسەی گوندی بەشیریان.

٤- مەدرەسەی مزگەوتی شێخ مصطفی-ی نەقشبەندی.

٥- مەدرەسەی مزگەوتی خانەقا لەهەولێر.

٦- مەدرەسەی گوندی دووسەرە، لای مامۆستا مەلا خلیل دووسەرەیی.

٧- مەدرەسەی شێخ عمری بالیسان لەگەڕەکی سێتاقان.

٨- مەدرەسەی مزگەوتی گەورە لەقەلاّ لای مامۆستا مەلا طیب دووشیوانی.

٩- مەدرەسەی مزگەوتی گەورە لەدیبەگە، لای مامۆستا مەلا اسماعیل.

١٠- مەدرەسەی گوندی (تۆبزاوە) لەخۆرئاوای شاری کەرکووك/ لای ماموستا مەلا عبدالمجید گەڕاوی.

١١- مەدرەسەی مزگەوتی حاجی محمود علاف- لای ماموستا ابوبکر کۆیی.

لە ١٩٦٣ لە مەدرەسەی تۆبزاوەو بەرەو شاری بەغدا بەرێکەوت و لەوێ چووە خزمەت خوالێخۆشبوو ماموستا مەلا (عبدالله الصوفی) لەمزگەوتی (جامع المرجان). لەو کاتە، بەقوتابی لەکۆلێژی (الدراسات الاسلامیة)ی سەر بەئەوقاف وەرگیراو هاوکات کرایە (ئیمام و خەتیب و مودەریس) لەمزگەوتی (الزعفرانیة الثانیة) هەر لەبەغدا. پاش نزیکەی ساڵێك کرایە مودەریس لە (المدرسة الوفائیة) هەر لەبەغدا، بۆ ماوەی (٧) ساڵ لەو مەدرەسەیە تەدریسی کرد، پاشان گواستیانەوە (پەیمانگای ئیسلامی) لە (الآسفیة) (٦) ساڵ لەوێ مایەوە هەر لەو ماوەیە، دۆستایەتیەکی (ماموستاو فەقێی) لەگەڵ خوالێخۆشبوو ماموستا مەلا عبدالکریم مدرس پەیداکردو لای ئەو زاتە، کتێبی (دلائل الاعجاز) عبدالقاهر جرجانی تەواوکرد.

لەو ماوەیە، کۆتایی بەخوێندنی لەکۆلێژی (الدراسات الاسلامیة) هێناو کرایە (ئیمام و خەتیب و مودەریس) لەمزگەوتی (العاقولی) لەم مزگەوتە ژوورێکی بۆ تەدریس تەرخان کردو دەیان فەقێ لێی کۆبوونەوە لەساڵی ١٩٧٩ بە پلەی (امین مکتبە) نەقلی شاری هەولێر کرا، ماوەیەك لەدەزگای ئەوقاف امین مەکتەبە بوو، پاشان لەم مزگەوتانەی لای خوارەوە، کرایە ئیمام و خەتیب و مودەریس.

١- مزگەوتی عبدالقادر شنۆیی- سپی

٢- مزگەوتی الصدیق- لەکورانی عەنکاوە

٣- مزگەوتی محمود عەلاف لەناو جەرگەی شار

٤- مزگەوتی عبدالقادر ماجدی لەگەڕەکی ئەندازیاران

پاشــان بنەماڵــەی خوالێخۆشــبوو (مامۆســتا مــەلا اسماعیــل نانەکــەلی) مزگەوتێکیان دروست کردو مامۆستایان بردە ئەوێ، هاوکات سەرپەرشتی (مەدرەسە)کەیانی دەکرد بەر لە چوونە مزگەوتی مەلا اسماعیل نانەکەلی.

لەسەر داواکاری جەنابی مامۆستا مەلا عبدالکریم مدرس، لەگەڵ حاجی (کامل احمد) بەرێوەبەری رابتەی ئیسلامی لەهەولێر بەرەو بەغدا بەرێکەوتن و چوونە خزمەت مامۆستا مەلا عبدالکریم و ئەویش بەمەلا قادری ووت ئەگەر بێتو بتوانی لەهەولێر مەدرەسەیەك بکەیتەوە لەسەر رێبازی کۆن دەرس بەفەقێیان بڵێی، من ئامادەم بڕوانامەی مەلایەتیت بدەمێ و تەواوی کتێب و سەرچاوەکانی ئەو مەدرەسەیەت بۆ دابین بکەم.

بەم شێوەیە، پاش بڕوانامەی کۆلێژی ناوبراو، بڕوانامەی مامۆستا مەلا عبدالکریم مدرس-یشی وەرگرت و گەڕایەوەو لەمزگەوتی (الماجدی) مەدرەسەیەکی بۆ تەدریس کردەوە. هەر لەو رۆژەوە تاکو ئەمڕۆ، ئەو مەدرەسەیە لەکارکردندایە بەسەدان زانای ئایینی سوودمەند بوونە لێی.

## لەمجازەکانی ئەم زاتە

١- مامۆستا مەلا کمال صادق

٢- مامۆستا مەلا بشیر خلیل حداد "دکتۆر بشیر- ووتارخوێنی ئێستای مزگەوتی )جلیل خیات) لە هەولێر".

٣- مامۆستا مەلا طارق سلیمان

٤- مامۆستا مەلا امین محسن- ئێرانی

٥- مامۆستا مەلا اسماعیل حمد امین

٦- مامۆستا مەلا عمر سەید محمد پیرداود

٧- مامۆستا مەلا رێبوار حمدامین

٨- مامۆستا مەلا لقمان مەلا بهاءالدین

ئەم زاتە لەماوەی تەدریس کردنی بەزۆری دەرسەکانی (اصول الفقه) ووتۆتەوە لەگەڵ تەفسیری (البیضاوي)و کتێبی (جمع الجوامع).

## لەدۆستەکانی:

١- مامۆستا مەلا سەید عبدالله گردەسۆری

٢- مامۆستا مەلا سەید محمد سەید اسماعیل پیرداود

٣- مامۆستا مەلا علی بیرە عارەبان

## لەکارە بەنرخەکانی:

١- نووسینەوەی (دراسە مخطوطات جامعة صلاح الدین) بەهاوکاری مامۆستا شێخ عبداللطیف بەرزنجیو مامۆستا (فاضل قفطان) تەواوی ئەم بابەتە لەچاپ دراوە.

٢- نووسینەوەی شەرحێکی دەستنووس بۆ کتێبی (استعارة)ی مەلا خدری دەشتی (منظومة)یەو هەر دەست نووسە.

٣- نووسینەوەی سەدان پارچە شیعر لەغەزل و قەسیدەو پێنج خشتەیی.

ئەم زاتە، بۆ ماوەی (٢) دانە ساڵ دەچێ، دووچاری نەخۆشی لەرزۆك بووەو وەکو جاران هاتوچۆی ئەم لاو ئەولا ناکات تەنانەت بۆ دەرس ووتنەوەش بەئۆتۆمبێل دەیبەن.

ئەمە بوو کورتەیەك لەژیاننامەی ئەم زاتە.

دووشەممە

٢٠٠٦/١٢/٢٥

سەرچاوە/

سەردانێکی تایبەت بۆ لای خودی مامۆستاو دیمانەییێك لەم بارەیەوە، تەواوی ئەم زانیاریانە خۆی دانی پێداناوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

ریزدار...

## وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئایینی هەرێمی کوردستان

## مامۆستا شێخ محمد شاکەلی

## ((سوپاس و پێزانین))

بە هەلی دەزانم کە تەواوی سوپاس و پێزانینی خۆمت بە بۆنەی لەچاپدانی ئەم کتێبەوە پێڕابگەیێنم خوازیارم لە ڕێگای جەنابتانەوە، دەستی کۆمەك و یارمەتی ئەم وەزارەتە بۆ هەموو هەنگاوێکی پیرۆز هەر درێژ بێ و لە وێنەتان زۆر بێ.

**نووسەر**

**عمر شێخ لطیف بەرزنجی**

**هەولێر ٢٠٠٧/٦/١**

# سوپاس و پێزانین

* سوپاسی بێ سنووری خۆم ئاراستەی مامۆستا (عثمان رشاد موفتی) دەکەم بەهۆی ماندوو بوونی لە بە چاپگەیاندنی ئەم کتێبە.
* سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی سەرۆك و ئەندامانی (لجنة الاعلام الديني)ی دەکەن لەدیوانی وەزارەتی ئەوقاو و کاروباری ئاینی حکومەتی هەرێمی کوردستان.
* بەپێویستی دەزانم، ئەوپەڕی سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی ئەو بەڕێزانە بکەم کە لە نووسینەوەی ئەم کتێبە یارمەتیان داوم، خوازیارم دەستی یارمەتیان بۆ هەموو کەس هەر درێژ بێ و لەوێنەیان زۆر بێ.

عمر شێخ لطیف بەرزنجی

هەولێر ١/٦/٢٠٠٧

# چەند رونکردنەوەیەك

گومان لەوەدا نییە کە هەر کتێبێك، لایەنێك تاوتوێی دەکات بەپێی توانا لەبارەیەوە

دەدویێ بەلاّم ئەم تاوتویێ کردنە ئەوە ناگەیێنیێ کە بابەتەکەی بەتەواوی بۆ خەڵکی یەکئالا کردۆتەوەو تەواوی وردەکاریەکانی خستۆتە روو. ئەوەی بەنیازی ئامارژە بۆ کردنیم، مەرج نیە لەم بابەتە هەموو لایەنەکان تاوتویێ کرابیێ، بەلاّم خاڵە سەرەکییەکان فەرامۆش نەکراون. کاتیێ دەستم دایە نووسینی ئەم کتێبە، دڵنیابووم لەوەی ئەگەری هەڵەبوونی تیا بەدی دەکریێ، بەلاّم بەراستگۆییەوە دەڵێم. هەر کەم و کورتیەك، لەهەر خاڵێك بەدی بکریێ، مەبەستی خراپی تیا نیە، بگرە ئەمرۆ هەر ئەوەندەم بۆ لووا، خوازیارم لەئایندە ئەم بابەتە بەلەمە زۆرترو بەتێرو تەسەل تر تاوتویێ بکریێو کتێبخانەکانی کوردستانی پیێ برازێنرێتەوە، زۆر بەراشکاوی داوای لێبوردن لەهەموو کەم و کورتیەکانی دەکەم، داوای بەخشینتان لێدەکەم، تکایە بە (حسن النیە) لەلاپەرەکانی بروانن و برگەکانی بخوێنەوە.

تێبینی:

لەریزبەندی چ ناوی زاناکان، چ ناوی حوجرەکان، پشتم بە بەرواری دامەزراندنیان بەستاوە واتە بەپێی گەورەیی تەمەن لەبارەیانەوە دوواوم.

**عمر شێخ لطیف بەرزنجی**

**هەولێر ٢٠٠٦/١٢/٣١**

# پوختەیەك دەربارەی ئەم كتێبە

گومان لەوەدا نیە كەم ئەم بابەتەش وەكو بابەتەكانی تری ئەم كوردستانە بەچەندین شێوە نووسراوەتەوە، كەسانێكی بەتوانا هەبوونە لەسەری بنووسن و خۆیانی پێوە ماندو بكەن، بەلاّم یان بەرچاوی من نەكەوتن، یان بەر گوێی. ناوەخنی ئەم كتێبە لەم تەوەرانە پێكهاتووە.

١- كورتەیەك لەژیانی حوجرەو فەقێ و قۆناغەكانی خوێندنی مەلایەتی.

٢- ئاماژە بۆ ئەو كتێب و سەرچاوە زانیاریانەی كە لەحوجرە پەیڕەو دەكران.

٣- رونكردنەوەی رەوشی لێهاتووی زانایانی ئاینی بەرامبەر بەكۆمەڵگا.

٤- وەبیر هێنانەوەی رەوشی هەندێ لەحوجرەو مەدرەسە كۆنەكانی ئەم شارە.

٥- ئاماركردنی ئەو حوجرانەی كە لەم سەردەمە سەرقاڵی فێركردنی ئادابی خوێندنی ئایینین لەسەر رێبازی كۆنی مەلایەتی.

٦- ئاماژەكردن بۆ ژیاننامەی هەندێ لەزانا كۆچ كردووەكانی ئەم شارە.

٧- وەدەرخستنی رەوشی هەندێ لەزانایانی ئەم سەردەمە لە بوواری تەدریس.

## ناوی ئەو زانا ئاینییانەی کە دەرچووی مەدرەسەی مزگەوتی گەورەی سەر قەڵاتن

١- ماموستا مەلا محمد پەرچەمی ساڵی ١٣٠٩

٢- ماموستا مەلا یوسف سولەیمانی ساڵی ١٣١٠

٣- ماموستا مەلا حسن مەلا رسول سیتی ساڵی ١٣١١

٤- ماموستا مەلا عبدالفتاح خەتیٚ ساڵی ١٣١٢

٥- ماموستا مەلا عبدالعزیز دەوبازی ساڵی ١٣١٣

٦- ماموستا مەلا سعید سەقزی ساڵی ١٣١٣

٧- ماموستا مەلا احمد قوم قەڵایی ساڵی ١٣١٣

٨- ماموستا مەلا ابراهیم پێشەیی ساڵی ١٣١٣

٩- ماموستا مەلا سعید سوهەیلی ساڵی ١٣١٤

١٠- ماموستا مەلا شێخ عارف شنۆیی ساڵی ١٣١٤

١١- ماموستا مەلا رشید بۆکانی ساڵی ١٣١٤

١٢- ماموستا مەلا عبداللە مەریوانی ساڵی ١٣١٤

١٣- ماموستا مەلا سعید نەهری ساڵی ١٣١٦

١٤- ماموستا مەلا محمد امین دووشیوانی ساڵی ١٣١٦

١٥- ماموستا مەلا ابراهیم شیوەلۆکی ساڵی ١٣١٦

١٦- ماموستا مەلا احمد وەردی ساڵی ١٣١٦

١٧- ماموستا مەلا سەید خدر سەید کمال ساڵی ١٣١٦

١٨- مامۆستا مەلا عبدالسلام باشووری ساڵی ١٣١٧

١٩- مامۆستا مەلا محمد امین سور سوورەیی ساڵی ١٣١٧

٢٠- مامۆستا مەلا طه شەقلاوەیی ساڵی ١٣١٨

٢١- مامۆستا مەلا عبدالله مەمی خەلی ساڵی ١٣١٨

٢٢- مامۆستا مەلا طه قاینجی (١٢/ جمادی الاول ١٣١٨)

٢٣- مامۆستا مەلا محمد پاراستی ٢/ رجب/ ١٣١٨

٢٤- مامۆستا مەلا حسن رەخزایی ٢٧/ شوال/ ١٣١٨

٢٥- مامۆستا مەلا محمد هێرۆیی ٢/ رەمەزان/ ١٣١٩

٢٦- مامۆستا مەلا اسماعیل قوشتەپەیی ٢١/ صفر/ ١٣٢٠

٢٧- مامۆستا مەلا طاهر کەرکووکی ٢١/ صفر/ ١٣٢٠

٢٨- مامۆستا مەلا طاهر شێخ وەتمانی ١/شعبان/ ١٣٢٣

٢٩- مامۆستا مەلا احمد ئالووسی شنۆیی ١٣٢٣

٣٠- مامۆستا مەلا محمد بادینی ٥/ رجب/ ١٣٢٣

٣١- مامۆستا مەلا مصطفی کەورکۆسکی ٥/رجب/ ١٣٢٣

٣٢- مامۆستا مەلا هبة الله افندی ئاکرەیی ٣٠/ صفر/ ١٣٢٤

٣٣- مامۆستا مەلا سعید شنۆیی ١٠/ رجب ١٣٢٤

٣٤- مامۆستا مەلا سید عبدالله موکریانی ٥/ ربیع الأول/ ١٣٢٥

٣٥- مامۆستا مەلا عبدالفتاح شوانی ٥/صفر/ ١٣٢٧

٣٦- مامۆستا مەلا علی شاوەیسی ٥/صفر/ ١٣٢٧

٣٧- مامۆستا مەلا عبدالرحمن سینگوڕی ١٧/ ربیع الآخر/ ١٣٢٨

٣٨- مامۆستا مەلا عثمان خورمەڵەیی ٢٢/ شعبان/ ١٣٢٨

٣٩- مامۆستا مەلاابراهیم بارانی ٢٢/ شعبان/ ١٣٢٨

٤٠- مامۆستا مەلا محمد تاج الدين تاليشى ١٤/ جمادى الآخر/ ١٣٣٠

٤١- مامۆستا مەلا عبدالله بورهانى ١٦/ محرم/ ١٣٣١

٤٢- مامۆستا مەلا عبدالقادر مزورى ١٥/ جمادى الآخر/ ١٣٣٢

٤٣- مامۆستا مەلا اسماعيل بانەيى ٦/ محرم/ ١٣٣٣

٤٤- مامۆستا مەلا محمد صادق حيدر آبادى ١٦/ جمادى الآخر/ ١٣٣٤

٤٥- مامۆستا مەلا صالح كۆزەپانكەيى ١٣٤١

٤٦- مامۆستا مەلا شێخ محمد عارف تاليشى ١٣/ شعبان/ ١٣٤٢

٤٧- مامۆستا مەلا محمد باقرتەيى ١٣/ شعبان/ ١٣٤٢

٤٨- مامۆستا مەلا احمد رحيم بانەيى (مەلاى رەشى چەغەميرە) ١٣٤٣

٤٩- مامۆستا مەلا عبدالله شەنەغەيى ١٣٤٣

٥٠- مامۆستا مەلا شێخ مصطفى-ى هەرشەمى نەقشبەندى ١٨/ رمضان/ ١٣٤٤

٥١- مامۆستا مەلا اسماعيل جديدەيى (جديدەلەك) ١٢/ ربيع الأول ١٣٤٥

٥٢- مامۆستا مەلا محمد مەخموورى ١/ ذوالحجة/ ١٣٤٥

٥٣- مامۆستا مەلا محمد صادق شەقلاوەيى ١/ذوالحجة/ ١٣٤٥

٥٤- مامۆستا مەلا محمد طيب دووشيوانى ٨/ ربيع الأول/ ١٣٤٥

٥٥- مامۆستا مەلا محمد سعيد باشتەپەيى- سيان ٢٧/ ذو القعدة/ ١٣٤٧

٥٦- مامۆستا مەلا عبيدساڵەيى ٢/ جمادى الآخره/ ١٣٤٨

٥٧- مامۆستا مەلا حسين مەلا ئۆمەرى ٢/جمادى الآخره/ ١٣٤٨

٥٨- مامۆستا مەلا سەيد اسماعيل مائيلى ١٩/ صفر/ ١٣٤٩

٥٩- مامۆستا مەلا محمد رشيد دەشتى ٢٣/ شوال/ ١٣٤٩

٦٠- مامۆستا مەلا شێخ محمد على باليسانى ٢٤/ ذوالحجة/ ١٣٤٩

٦١- ماموستا مەلا محمد خالد دەشتی ٢٤/ذوالحجة/ ١٣٤٩

٦٢- ماموستا مەلا طه قورشقلی (قورشاغلویی) ٨/ رجب/ ١٣٥٠

٦٣- ماموستا مەلا احمد بانەیی ٢/ محرم/ ١٣٥١

٦٤- ماموستا مەلا محمد سابلاخی ٨/ جمادی الأول/ ١٣٥١

٦٥- ماموستا مەلا سەید عبدالكريم بەرزنجی ٢٠/ شعبان ١٣٥١

٦٦- ماموستا مەلا سەید علاءالدين جەنتەدەری ٣/محرم/ ١٣٥٢

٦٧- ماموستا مەلا ویسی گرتكی ٣/محرم/ ١٣٥٢

٦٨- ماموستا مەلا شێخ محمد سولەیمانی ٣/محرم/ ١٣٥٢

٦٩- ماموستا مەلا مصطفى جوانرۆیی ٣/محرم/ ١٣٥٢

٧٠- ماموستا مەلا سەید حسن تالیشی ٩/ ذوالعقدة/ ١٣٥٢

٧١- ماموستا مەلا محمد موكریانی ١٥/ ذوالعقدة/ ١٣٥٢

٧٢- ماموستا مەلا محمد امين وەلزێ /ربیع الأول/ ١٣٥٣

٧٣- ماموستا مەلا محمد امين گردەمامكی ٢٩/ ذوالحجة/ ١٣٥٣

٧٤- ماموستا مەلا سەید عبدالله تەوەكەلی ٣٠/ جمادی الأول/ ١٣٥٣

٧٥- ماموستا مەلا شێخ عمری بالیسانی ٣٠/ شوال/ ١٣٥٣

٧٦- ماموستا مەلا صالح لۆلانی ١١/ ربیع الأول/ ١٣٥٤

٧٧- ماموستا مەلا علی تەڵكاشی ١٣/ جمادی الأخرة/ ١٣٥٤

٧٨- ماموستا مەلا عبدالرحمن وەلزێ ١٩/ ذوالحجة/ ١٣٥٤

٧٩- ماموستا مەلا محمد صالح سەقزی ٢٥/ ربیع الأول/ ١٣٥٥

٨٠- ماموستا مەلا مصطفى بارۆكاری ٢٥/ ربیع الأول/ ١٣٥٥

٨١- ماموستا مەلا حاجی مصطفى سودانی ٢٩/ ربیع الأول/ ١٣٥٥

٨٢- ماموستا مەلا عمر تەرجانی ٧/ رجب/ ١٣٥٥

٨٣- ماموٚستا مەلا سەید عبدالقادر زەنكیدەری ٧/ رجب/ ١٣٥٥

٨٤- ماموٚستا مەلا عبدالمجید هێشمنی- خەنحالی

٨٥- ماموٚستا مەلا علی عباس- بشیریانی

٨٦- ماموٚستا مەلا حسن مزوری

٨٧- ماموٚستا مەلا محمد سارتكەیی

٨٨- ماموٚستا مەلا محمد امین سوێری

٨٩- ماموٚستا مەلا صادق لهێبانی

٩٠- ماموٚستا مەلا محمد سعید لێبهانی

٩١- ماموٚستا مەلا سەید عبدالقادر گردەشینەیی

٩٢- ماموٚستا مەلا عبدالكریم شوٚڕە زەرتكەیی

٩٣- ماموٚستا مەلا عثمان شەقلاٚوەیی.

# سەرچاوەکان:

بۆ نووسینی ئەم کتێبە، سوودم لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگرت:
١- کتێبی (علماء مدارس في أربيل) مامۆستا زبير بلال اسماعيل- ١٩٨٤.
٢- کتێبی (ژیانی فەقێیەتی لەکوردستان لەسەدەی (١٣- ١٤) کۆچی- مامۆستا مەلا محمد علی عەلیاوە/ ٢٠٠٣.
٣- کتێبی (فەقێ و فەقێیانی لەکوردستان) مامۆستا سەید مصطفی سەید محمودیان زەمزەمیرانی تەهران، ئێران ١٣٨٢ك.
٤- کتێبی (الأكليل في محاسن اربيل) مامۆستا عبدالله فەرهادی- هەولێر- ٢٠٠١ بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف.
٥- کتێبی (هەولێرم وادیوەو بیستووە) مامۆستا سەید مولود بێخاڵی- هەولێر (١٩٩٧) وەزارەتی رۆشنبیری.
٦- کتێبی (گەشتێك بەناو مزگەوت و تەکیەکانی ناو شاری هەولێر) نووسینی (عمر شێخ لطیف بەرزنجی) و بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف.
٧- کتێبی (کورتەیەك لەژیاننامەی زانا ئاینییە کۆچ کردووەکانی سەدەی بیستەم لەهەولێر)- (عمر شێخ لطیف بەرزنجی)و بلاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف- ٢٠٠٤- هەولێر.
٨- سەردانی راستەوخۆی تەواوی حوجرەکانی ئەم سەردەمەو گفتوگۆ لەگەڵ مامۆستاو فەقێیەکانی.
٩- سەردان و دیدەنی راستەوخۆی هەندێ لەو زانا ئایینیانەی کەژیاننامەیانم نووسیوەتەوە.
١٠- هەندێ گۆڤاری خۆری ئیسلام/ بلاوکراوەی وەرزی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی هەولێر.

# ناوەرۆك



## نووسەر لەچەند دێڕێکدا :

* ناوی تەواوی: عومەر شێخ لەتیف شێخ رەزا شێخ مەعروف بەرزنجی یە.

* لە ١٩٥٢/٧/١ لەگوندی (کەڵووڕ) لە پارێزگای کەرکوک هاتۆتە دونیاوە.

* لە ١٩٥٩/١٠/٣ هەر لەشاری کەرکوک چووەتە قوتابخانە.

* لە (١٩٦٧) بۆ کارکردن چووە شاری سلێمانی و تاکو پۆلی سێیەمی ناوەندی لەوێ خوێندووە.

* لە بەهاری ساڵی (١٩٨١) باری کردە شاری موسڵ.

* لە بەهاری ساڵی (١٩٨٢) وە خۆی و خانەوادەکەی نیشتەجێی شاری هەولێری دێرینن.

چاپخانەی منارە - هەولێر